



زنجیرەی بیداری ٤



# وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ

محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

چاپی یەکەم

٢٠١٧

# وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ

محەممەد سالْح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

چاپی یەکەم

٢٠١٧

# ناوەڕۆک

## دەستپێك

یەکێـــك لە پایە هـــەرە گرنگەکانی باوەڕ بە خـــودا، باوەڕبوونە بـــەڕۆژی دوایی، ڕۆژێك، کە هەموو مرۆڤێك، جا ژن بێت، یان پیاو.. باوەڕداربێـــت، یان بێباوەڕ.. گەنج بێت، یان پیر، تێدا ئامادە دەبێت بۆ حسابو کتابو پرسیارو لێپرسینەوەو لێپێچینەوەی خودایی.

بۆیـــە ئێمـــەی باوەڕدارو موســـڵمان، یەقینێکـــی تەواومان هەیە، کە لەو ڕۆژە ســـەختو دژوارەدا زیندوو دەبینەوەو هەقو حســـابمان لەگەڵـــدا دەکرێتو کەســـیش لە لێپرســـینەوەی ئەو ڕۆژە ناخۆشـــە ڕزگاری نابێـــت، مەگەر پەروەردگار، بە کەرەمو میهرەبانی خۆی لێی ببوورێتو بەبێ حسابو کتاب بیخاتە ناو بەهەشتەوە.

هەڵبەت ژیان، سەرتاپای بەرپرسیارێتییە، بۆیە کەس ناتوانێت لە دونیادا، لەو بەرپرســـیارێتییە ڕابکات، کە لەلایەن پەروەردگارییەوە پێی سپێردراوە، جا ئەو کەسە لەهەر پلەوپایەو پۆستێکدا بێتو لە هـــەر ڕەگەزو نەتەوەو ئایینێك بێتو لە هەر شـــوێنێك بژیتو هەر ئایدیاو بیروباوەڕێکی هەبێت.

لـــەم ســـۆنگەیەوە، پێویســـتە هەمووومـــان لـــە ناخەوە هەســـت بەرپرســـیارێتی بکەیـــن؛ چونکە پێغەمبەری ســـەروەرمان، دروودی خودای لێ بێت، فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ).

أخرجه البخاري ومسلم في صحيحهما عن ابن عمر.

واتە: «هەمووتان شوانن‌و هەمووشتان بەرپرسن لەوەی لەژێر ڕکێفیدایە». جا لە هەر ئاستو پلەو پایەیەك دابین‌و هەر كارو فرمانێكمان پێ سپێردرا بێت، هەروەها دەبێت لە ئاست هەموو ئەو تاوان‌و گوناهو كەتنانەی كە لە ژیاندا ئەنجاممان داون‌و دەدەین، خۆمان بەبەرپرسیار بزانین‌و هەمیشە بیر لەو ئایەتە پیرۆزە بكەینەوە، كە خودای باڵادەستو تۆڵەستێن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات.

واتە: (ڕایانگرن، بێگومان پرسیاریان لێ دەكرێت). هەروەها ئەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە، بزانین.. كە وا دوو ڕێگەمان لە پێشە، یان بەرەو بەهەشت دەچین!، یان بەرەو دۆزەخ!!

جا كە باوەڕمان وایە مردن‌و زیندووبوونەوە، هەردووكیان هەقن‌و هاتنیشیان شتێكی حەتمی‌و مسۆگەرەو لەو ڕۆژەدا، یەكە بە یەكە پرسیارمان لێ دەكرێت، ئەگەر بەقەدەر تۆزقاڵێكیش بێت!

دەبێت هەر لە ئێستاوە، پێش ئەوەی مردن یەخەمان بگرێتو لە دەرگامان بدات، خۆمان بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە ئامادە بكەین‌و تەرازووی كردارەكانمان هێندە قورس‌و گران بكەین، كە بە فەزڵ‌و دلۆڤانیی خودا، بتوانین لەو زاڵگە (سیطرة)یە ڕزگارمان بێتو لە بارەگای پەروەردگار، ڕووڕەش‌و شەرمەزار نەبین.

بۆیە بەندە بە پێویستم زانی تیشكێك بخەمە سەر ئەم بابەتە گرنگو هەستیارەو پەیامێكی گرنگ ئاڕاستەی هەموو كەس‌و چین‌و توێژێكی ناو كۆمەڵگەی موسڵمانان بكەم‌و بەیادیان بهێنمەوە، كەوا ئەو ڕۆژە چاوەڕێی هەر هەموومان دەكاتو هەموومان لەو

ڕۆژەدا لەبەردەم دادگای خودای مەزن ڕادەگیرێینو ئامادە دەکرێین، کەســیش ناتوانێت فریامان کەوێتو ببێتە پارێزەرو بەرگریمان لێ بــکات، مەگەر کردەوە ســالحو چاکەکانمان نەبێت، بۆیە پێویســتە مەردی خودابین، خۆمان بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە ئامادە بکەینو هەگبەی خۆمان پڕ لە زادو تێشووی قیامەت کەین، تا تاجی ڕزگاریو ســەرفرازی لەسەر نێینو ڕەزامەندیی پەروەردگار بەدەست بهێنینو لەو کەسانە بین، کە کتێبی خۆیان بەدەستە ڕاست وەردەگرن.

محەممەد سالح پێندرۆیی(جگەرسۆز)
٢٠١٥ /٧/٢٧

## ئەی مرۆڤی موسڵمان(من، تۆ، ئەو)

هەموو مرۆڤێکی موسـڵمانی پێگەیشـتووو تێگەیشتوو، چ پیاو بێت، یاخود ژن، لە ڕۆژی هەسـتانەوەدا، لە گشت گوفتارو ڕەفتارو کردارە وردو درشـتەکانی خۆی بەرپرسـیارە، ئاخۆ ڕێگای ڕاسـتی هەڵبـژاردووە، یاخود ڕێگای چەوت، کاری خێـری کردووە، یاخود بـەدو خراپ، زمانی بە چاکە گەڕاوە، یاخود بە خراپە، ڕەفتارێکی جوانـی لەگەڵ خەڵکدا نواندووە، یاخود ناشـیرینو قێزەون. تۆوی چاکەی لە کێڵگەی ژیاندا چاندووە، یاخود شـەڕو فیتنەو ناکۆکیو دووبەرەکی.

بێگومـان لـەو ڕۆژەدا، بێجگە لە سـکاڵای ئەوانی دیکە، گشـت ئەندامانی جەستەمان، وەك: گوێ، چاو، دەست، قاچ، زمان، دڵ و... تاد. لەسـەر کارە ناڕاستەکانمان، ڕەفتارە ناشـیرینەکانمان، زمانە زبرەکانمان، دڵە پیسـەکانمان، لە دادگای خودا سـکاڵامان لەسـەر تۆمار دەکەنو شایەتیمان لەسەر دەدەن.

هەر وەك خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتــه: (بەڕاســتی گوێو چــاوو دڵ، هەموو ئەوانــه، خاوەنیان پرسیاریان لێ کراوە).

هەروەهــا لەبارەی زمانــەوە دەفەرمێت: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ ق.

واتــه: (هــەر وتەیــەك لــە دەمــی دەردەچێــت، چاودێرێکی بەسەرەوەیەو دەینووسێت).

ئەڵبــەت هەر شــتێکی خراپ، لــە بوختان هەڵبەســتنو درۆو ناپاکیو ســیخوڕیو جوێنو قســەهێنانو بردن و...تاد. گوێبیســت بووبین، یان هەر شــتێکی ناپەســەندو قەدەغە لــە نەزەرو فیلمو وێنــەی حەرامو ناشــەرعی بەچاو ســەیرمان کردبێت، یاخود هەر کارێکی حەرامو ناشــەرعیمان بەدەســتو قاچ ئەنجــام دابێت، یان هەر کەتنێکمان لە درۆو بوختانو پاشــملەو دووزمانیو جوێندانو تەریقکردنەوەو ناسوپاســی، بەزمان ئەنجامدان دابێت، یاخود هەر گوناهێکمان لەناو دڵو بەپەنهانی کردبێت. لەو ڕۆژەدا هەر هەموو ئەوانە ئاشکرا دەبێت؛ چونکە دەکرێ لە زاڵگەکانی دونیا ڕزگارمان بێت، بەڵام هەرگیز ناتوانین لە زاڵگەی ڕۆژی هەستانەوەدا، خۆمان ڕزگار بکەین.

مســۆگەر خودای باڵادەست بانگی فریشــتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو کەســانە ڕاگــرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ صافات.

بێگومان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایــا کێ لە ئێمــە، خۆی بۆ ئەو زاڵگە ســەختو دژوارە ئامادە کــردووە؟! کێ گەرەنتی ئەوەی دراوەتــێ لەو زاڵگەیە دەپەڕێتەوەو

قۆڵبەســت ناکرێت؟!!! کێ دەزانێ خۆی لەو کەسانە نییە، کە پێی دەڵێن ڕایگرن... ڕایگرن... قۆڵبەستی بکەن!! ئەو لە دونیادا، لەسەر ئەنجامدانی تاوانگەلێكو گوناهگەلێك بەرپرســیارە، دەبێت وەڵامی پرســیارەکانمان بداتەوە!!!! کێ لە ئێمــە وەڵامی قانعکەری پێیە؟! یاخود وەڵامی خۆی بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە ئامادە کردووە؟!!!!

بێگومــان ئەو ڕۆژە، ڕۆژی نەفســی نەفســییە، کــەس خۆی لە کــەس ناکات بە خاوەن، نە منداڵ لە دایباب، نە دایباب لە منداڵ، نە هاوســەر لە هاوســەر، نە شێخ لە مورید، نە مورید لە شێخ، نە کوێخا لە ســەپان، نە سەپان لە کوێخا، نە دەسەڵاتدار لە ڕەعیەتو نە ڕەعیەت لە دەسەڵاتدار و...تاد.

بەڵــێ، هەمووومان تاك تاکــە، لەو زاڵگەیــە ڕادەگیرێینو یەکە بە یەکە، پرســیارمان لێ دەکرێت، جا پێویستە هەر ئێستا خۆمان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەینو زادو زەخیرەو توێشــوو کۆ بکەینەوە؛ چونکە لەو ڕۆژەدا، واسیتەو واسیتەکاری، یان بەرتیلو ڕیشوەکاری، یــان پلەوپایە، یان پارەوپووڵ، یان خزمایەتی، دادمان نادات! تەنها کارتێك کە لەو ڕۆژە ســەختو دژوارەدا بەدەســتەوەمانەوە بێتو فریامان کەوێتو باڵانســی تێدا بێت، کارتی باوەڕێکی ڕاستەقینەو کردارێکی ڕاستو درووستو دڵێکی ساغو ئاودراوە بە باوەڕ، کە دوور بێت لە هاوەڵ درووســتکردن بۆ خوداو غەڵو غەشو تەڵەکەبازیو دووڕوویيو خراپەکاریو ملهوڕیو ستەمکاری.

## ئەی هاوسەران

ئـــەی هاوســـەران! هـــەر وەك دەزانن، پیـــاوو ژن دوو کۆڵەگەی هەرەبەهێـــزی خێزانـــن‌و بناغەی خێزانیش، لەســـەر دەســـتی ئەو دووانـــە دەهێتـــە دارشـــتن، کۆمەڵگەش لە یەکەکانـــی خێزان پێك دێـــت، کەواتە: ئێوە ڕۆڵێکی کاراو ســـەرەکیتان هەیە لە بنیادنانی خێزان‌و کۆمەڵگەو خســـتنەوەی وەچـــەو ئاوەدانکردنەوەی زەوی‌و درووستکردنی شارستانییەت‌و مێژووی ڕابوردوو و ئێستاو ئایندە.

لەم ســـۆنگەیەوە دەبێت ئەو ڕاســـتییە حاشـــاهەڵنەگرە بزانن، کەوا کامەرانـــی‌و بەختەوەریی هەر کۆمەڵگەیـــەك، پەیوەندیی بە خانـــەوادەو خێزانەکانی ئـــەو کۆمەڵگەیەوە هەیـــە، بەختەوەری‌و کامەرانیـــی هـــەر خێزانێکیـــش، بە پلـــەی یەکەم پەیوەســـتە بە هاوسەرانەوە، کامەرانی‌و بەختەوەریی ئێوەش پەیوەستە بە جۆری بیرکردنەوەو جۆری مامەڵەو ڕەفتارکردنەوە لەگەڵ خودی خۆتان‌و ئەندامانی خێزان‌و هاوسێیان‌و گشت چین‌و توێژەکانی کۆمەڵگەوە.

بۆیـــە هـــەر جـــۆرە بیرکردنەوەیەکی ئەرێنییانە بۆ پرۆســـەی پێکەوەژیان، چ لە چوارچێوەی خێزاندا بێت، یاخود لە چوارچێوەی کۆمەڵگـــەدا بێت، ڕەنگدانەوەیەکی ئەرێنی لەســـەر کۆی پرۆســـەی ژیانی خێزان‌و کۆمەڵگە درووست دەکات، پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

بۆیە پێویستە، ئەم کاروانە بە ئاقاری پێکەوەژیان‌و پێکەوەسازان بهێتـــە ئاراســـتەکردن، تا دەگاتـــە کەناری بەختەوەری‌و خۆشـــی‌و تەبایی‌و ئاشتی‌و ئاسوودەیی‌و... تاد.

بەڵام مخابن، هەندێك لە هاوسـەران، هەمیشـە لەناو خێزانو کۆمەڵگەدا، بەشـێکن لە کێشـە، بەشێك نین لە چارەسەر، هەرگاڤ برینەکان زامدار دەکەن، نەك تیمار، هەردەم لەناو باخچەی ڤیانو خۆشەویستیدا، دڕك دەچێنن، نەك گوڵو ڕەیحانەو نێرگز. هەمیشه لـە کێڵگەی ڤیانو ژیاندا، تۆوی ناتەباییو دووبەرەکیو دووڕووییو بۆختانهەڵبەسـتنو دڵڕەشـیو دڵپیسـیو بەدگومانـیو ڕژدیو گەندەڵیو شەپرزەییو شەڕو ئاژاوەو پەرتەوازەییو... تاد دەڕوێننو سڵ لە هیچ کارێکی بەدو ناپەسەندو نایاساییو ناشەرعی ناکەنەوەو بەنزین بە ئاگردا دەکەنو تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنن.

بۆیـە ڕووی قسـەکانم لەو جۆرە هاوسـەرانەیە، کە تا ئێسـتا هەر خەریکی ئەم بەزمو ڕەزمانەنو سـەرقاڵی شـێواندنی دیمەنو تابلۆکانـی ڤیـانو ژیانـنو ژیانـی دونیایان لە خەڵـك کردووەتە دۆزەخێکی ئاگرینو بڵێسەدار!!

وەك ئەو کەسەی شەلم کوێرم کەس نابوێرم، ڕاستو چەپ مافی خەڵکی پێشـێل دەکەنو حورمەتو شکۆمەندییان لەکەدار دەکەنو ژەهری بوغزو ڤین لە ناو جەسـتەی کۆمەڵگـەدا بڵاو دەکەنەوەو دڵی شـەیتانو شەیتانسـیفەتان خۆش دەکەنو بێ فەرمانی خودا دەکەنو دڵی خاوەن باوەڕانو سینەسافانو دڵپاکانو فریشتەئاسایان ناخۆش دەکەن!!

بەڵێ، ئەم جۆرە هاوسـەرانە، گورگن، بەڵام خۆیان لە پێسـتی مەڕدا مەڵاس داوە.

ئایـا ئـەم جۆرە کەسـانە، ڕۆژێك لە ڕۆژان ڤـەت بیریان لەوە کردووەتـەوە، کەوا چرای ژیانیـان دەکوژێتەوەو بەرەو لای خودای

بالادەست دەگەڕێنەوە! ئایا ئەو جۆرە کەسانە، لەو ڕۆژە سەختەدا، کاتێـك خودای بالادەسـت بانگی فریشـتەکانی دەکاتو فەرمانیان پـێ دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو جۆرە هاوسـەرو پیاوو ژنانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان پرسـیاریان لێ دەکرێت.

لـە ناخـی دڵـەوە بەو جـۆرە هاوسـەرانە دەڵێم: ئـەو ئاگرە سووتێنەرەی کە داتان گیرساندووە، لە ڕۆژی هەستانەوەدا، خۆشتان دەسـووتێنێتو ماڵتان وێران دەکاتو تەفـرو توناتان دەکات، بۆیە مـەردی خودا بـن، ئەم هەڵـە بقۆزنەوەو ئەم ژیانـە بە دەرفەت بزانـن؛ بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سـەر ڕێگەی ڕاسـتو ڕەزامەندیی خودایی مسـۆگەر بکـەنو جوانیو پیرۆزیو شـکۆمەندی بە ژیان ببەخشن.

## ئەی دایبابەکان

ئـەی دایبابـەکان! منـداڵ، ئەمانـەتو بەهرەو بەخششـێکی خوداییە، سـۆمای چاوە، خۆشـیو ئاسـوودەیی بـەدڵو دەروونی دایبابـەکان دەبەخشـێت، دڵیان بـە دونیا خـۆش دەکات، بەهۆی منداڵەوە ئۆقرە دەگرنو دەحەسـێنەوە، لە وەچاخکوێری ڕزگاریان دەبێت، هیواو ئومێدیان بە ئایندە زیاد دەبێت، هەمیشە شانازییان پێوە دەکەنو هەرچی هەیانە، لە پارەوپووڵ، لە سـەروەتو سامان، لـە هەوڵو کۆشـش، لە هێزو توانا، لە سـۆزو خۆشەویسـتیو لە گیانبازیو قوربانیدانو... تاد. بە منداڵەکانیان دەبەخشن؛ بۆئەوەی

لە دوارۆژدا ببن، بە کەسانی زاناو داناو بەتوانا، هەروەها بتوانن لە گۆڕەپانی کارو داهێناندا، لە پێشکەوتن‌و سەرکەوتندا، لە تێگەیشتن‌و پێگەیشتندا، ئەسپی خۆیان تاو بدەن‌و بەرەو ئاسۆیەکی گەش‌و زەردەپەڕ بکەونە سەر ڕێ.

بەڵام ئەرکی دایبابەکان، لێرە کۆتایی نایەت؛ چونکە ئەمە نیوەی ڕێگایە، هێشتا نیوەی تر ماوە، واتە: ئەمە بۆ دونیایە، ئەدی بۆ قیامەت‌و پەسڵان دەبێت چی بکەن؟!!

یەکە بە یەکەی دایبابەکان، ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە دەزانن، کەوا ئەرکی پەروەردەو فێرکردن‌و تێگەیاندن‌و پێگەیاندن‌و ڕاهێنانی منداڵەکانیان لەسەر شانیانە؟

هەر وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرموویەتی: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، وَالرَّجُلُ رَاعٍ في أَهْلِه وَهُوَ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِه، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ في بَيْتِ زَوْجِها وَمَسْؤولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِها، وَالْخَادِمُ رَاعٍ في مَالِ سَيِّدِه ومَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِه». متفق عليه.

واتە: «هەمووتان شوانن‌و هەمووشتان لێپرسراون بەرانبەر ڕەعیەت‌و ژێردەستەکانتان، پێشەواو کاربەدەستان لێپرسراون‌و لێپرسراویشن بەرانبەر ڕەعیەتەکانیان، پیاو شوان‌و بەرپرسی ماڵ‌و منداڵەکەیەتی، لێپرسراویشە بەرانبەریان، هەروەها ئافرەتیش بەرپرسیارە لەناو ماڵی مێردەکەیداو لێپرسراویشە، خزمەتکاریش لە ماڵی گەورەکەیدا لێپرسراوەو بەرپرسیارە لەوەی لەژێر ڕکێفیدایە».

لەم سۆنگەیەوە دەپرسین: ئایا ئێوە دەزانن، کەوا لە چارەنووسی منداڵەکانیان بەرپرسیارن؟ ئایا دەزانن، منداڵەکانتان لە ڕۆژی

هەســـتانەوەدا، یان هۆکارێکن بۆچوونە بەهەشتتان، یان هۆکارێکن بۆ چوونــە دۆزەختان؟!!، یان گەواهیتان بۆ دەدەن، یان گەواهیتان لەسەر دەدەن!!!

لەم بارەیەوە، خودای مەزن داوا لە بڕواداران دەکات، کە خۆیانو کەســـوکاریان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکــەن، هەر وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ التحريم.

واتە: «ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، خۆتانو کەســـوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك، کە ســـووتەمەنییەکەی ئادەمیو بەردە، چەند فریشـــتەیەکی دڵڕەقی توندوتیـــژی وا، سەرپەرشـــتی ئەو (ئاگری دۆزەخـــەن)، کە نافەرمانی خودا ناکەن، لـــەوەی کە فەرمانیان پێ بدات، هەروەها چ فەرمانێکیان پێ بدرێت دەیکەن».

ئەی دایبابەکان، ئاخۆ ئێوەی باوان، خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە سەختە ئامادە کردووە، کە خودای باڵادەست فەرمان بە فریشتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ﴿ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. ڕایان گرن، بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

کاتێـــك لـــەو ڕۆژە دژوارەدا، پرســـیارتان لـــێ کـــرا: ئاخۆ ئێوە لەســـەر چ ڕێچکـــەو ڕێبازێـــك منداڵەکانتـــان پـــەروەردە کردبوو، ڕێبازی ئیســـلامو پێغەمبـــەر(ﷺ)، یاخود ڕێبازەکانـــی دیکە؟ ئایا منداڵەکانتان فێرە قورئانو فەرموودە کردبوو، یان نا؟ ئایا خودا لە پەروەردەکردنی منداڵەکانتان ڕازی بوو، یان نا؟ ئایا لەسەر بنەمای خواخوامانـــە، ئیســـلام ئایینمانـــە، محەممەد(ﷺ)پێغەمبەرمانە،

قورئان پەرتووکمانە گوێ کرابوون، یان نا، ئایا خۆراکو پۆشاکیان، خواردنو خواردنەوەیان، بژێوی ژیانیان حەڵاڵ بوو، یان حەرام؟ ئایا لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی پەروەردە کرابوون، یان فرەپەرستی؟ ئایا لە دونیادا لەسەر هەق ژیابوون، یان لەسەر ناهەق(باطل)؟ ئایا ئەو ئەمانەتەتان پاراستبوو کە ڕادەستی ئێوەمان کردبوو، یان نا؟ ئایاو ئایاو ئایا و.......

ئایا خۆتان بۆ ئەم هەموو پرسیارەو پرسیارەکانی دیکە ئامادە کردووەو وەڵامی تەواوتان پێیە؟!!

بۆیە هیوادارم، مشوری ئەم بابەتە بخۆن، پێش ئەوەی ڕۆژی مردن بێت؛ چونکە کە هات، ئیدی بەکەس ناگەڕێتەوەو نامەی کردارەکان دادەخرێتو ژیانی ئێرە بۆ هەتاهەتایە کۆتایی دێت.

## ئەی منداڵان (جگەرگۆشەکانی دایەو بابە)

ئەی منداڵەکان! ئایا دەزانن، دایبابەکانتان، هۆکاری سەرەکیی بوونی ئێومبوون، ئەوان ئەو سێبەرە بوون، کە ئێوە لەژێریدا حەسانەوە، ئێوە دڵۆپێك ئاو زیاتر نەبوون، بەهۆی ڕەنجی شانی دایبابەکانتانەوە گەورەبوونو بووژانەوە، ئێوە لاوازو بێدەسەڵات بوون، بە هەوڵو هیممەتی دایبابەکانتان، بوون بە کەسانی بەهێزو بەتواناو گەنجو لاو، ئێوە بێ پۆشاکو خۆراك بوون، دایبابەکانتان ئێوەی خۆراك داو پۆشتە کرد، ئێوە نەزانو نەفام بوون، دایبابەکانتان ڕێگەی زانستو خوێندنو فێربوونیان بۆ ئاسان کردنو ئێوەی

لــە نەزانینەوە بەرەو زانایــی، لە لاوازییەوە، بــەرەو بەهێزی، لە منداڵییەوە بەرەو گەنجێتی، لە دەبەنگییەوە بەرەو وشــیاری برد، واتــە: ئێوە لە پڕێك نەبوون بە کوڕێك، بەڵکوو بە شــەونخوونیو لەخۆبوردەیی دایبابەکانتان بەم ڕۆژە گەشە گەیشتن!!

بۆیــە وا مەزانن، ئەمە کارێکی ئاســان بووە، یاخود بێبەرانبەر بووە، ڕاســتە بەپێی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەی بۆ ئێوە کراوە، بەشێك بووە لە مافەکانتان، بەڵام لە ئیسلامدا، ئەوەی مافی هەبێت، ئەرکیشی لەسەرە، تەنانەت ئەرکەکان دەکەونە پێش مافەکانەوە.

کەوابێت، هاوسەنگی نێوان ئەرکو مافەکان بپارێزن، دوای مافی خودا، کە بریتییە لە ناسینو پەرستنی ئەو زاتە بە یەکتاپەرستیو هاوەڵ بۆ قەرارنەدانو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بە دڵســۆزیو پابەندبــوون بە (قورئــانو فەرمودە)وە، ئینجا ڕاســتەوخۆ مافی دایبابەکان دێت.

لەم بارەیەوە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: (وە پەروەردگارت، بڕیاری داوە کە هیچ شتێك نەپەرستن، بێجگە لە ئەوو لەگەڵ دایكو باوکتان چاکە بکەن، ئەگەر یەکێکیان (باوکــتو دایکــت)، یــان هەردووکیــان لای تۆ پیر بوون، قســەی ناخۆشــیان پێ مەڵێ، تەنانەت ئۆفیشو تێیــان مەخوڕەو پێیاندا هەڵمەشــاخێ، (بەڵکــو) وتەی نــەرمو شــیرینیان (لەگەڵدا) بەکار بهێنە).

دیســان لەبارەی چاکەکردن لەگــەڵ دایبابەکانەوە دەفەرموێت:

﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ
وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ
أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ
وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٥ ﴾ الأحقاف.

واتە: «ئێمە ئامۆژگاریی ئادەمیمان کرد بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکیدا؛ دایکی بە ناڕەحەتی و ئازارەوە هەڵی گرتووەو بە ئازارو ناڕەحەتیش بوویەتی، ماوەی دووگیانبوونی (دایك) پێیەوەو لە شیربڕینەوەی سی مانگە، تا دەگاتە تافی لاوی (پێگەیشتووی لاشەیی و ژیری) و دەگاتە چل ساڵی، دەڵێ ئەی پەروەردگار ڕام بهێنە؛ تا شوکرانەبژێریی ئەو بەهرەو چاکەت بکەم، کە ڕشتووتە بەسەر من و دایك و باوکم داوە، (ڕام بهێنە) کردەوەی چاك بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت، نەوەکانیشم چاك و صاڵح بکە، بێگومان بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوەو بەڕاستی من لە موسڵمانانی گەردنکەچم.)

ئەی جگەرگۆشەکانی دایەو بابە، ئەی ئەوانەی هەمبەر مافەکانی دایبابەکانتان خەمساردو بێباکن، ئەی ئەوانەی دڵی دایبابەکانیان دەڕەنجێنن، ئەی ئەوانەی مافیان پێشێل دەکەن، ئەی ئەوانەی دایبابەکانیان تەریق دەکەنەوە، ئەی ئەوانەی ڕێز لە دایبابەکانتان ناگرن، ئەی ئەوانەی دایبابەکانتان ئازار دەدەن و بە جوانترین و شایستەترین شێوە بەخێویان ناکەن، ئەی ئەوانەی بە چاوێکی سووکەوە سەیری دایبابەکانتان دەکەن، ئەی ئەوانەی مافی کەسانی دیکە دەخەنە پێش مافی دایبابەکانتانەوە، ئەی ئەوانەی کێشە بۆ دایبابەکانتان درووست دەکەن و بە گوێیان ناکەن، ئەی ئەوانەی دڵتان بۆ دایبابەکانتان لە بەرد ڕەقترە، تکایە خۆتان

دەســـتخەرۆ مەکەنو قەت وا مەزانن لە ڕۆژی هەســـتانەوەدا لێتان ناپرســـرێتەوەو چاوپۆشـــیتان لێ دەکرێت، ڕاستە خودای باڵادەست مۆڵەت بە ســـتەمکارەکان دەدات، بەڵام قەت لە ستەمی ستەمکاران خۆش نابێت.

بۆیە کاتێك ئەو ڕۆژە سەختە هات، کە ڕۆژی هەستانەوەو هەقو حیســـابە، کە خودای باڵادەست لەو ڕۆژەدا فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو منداڵانەی دڵی دایبابەکانیان شکاندووەو مافەکانیان پێشێلکردووە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ (٢٤) ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا خۆتان بۆ پرســـیارەکانی ئەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە ئامادە کردووە؟ کاتێك پرســـیارتان لێ دەکرێـــت: ئایا بەپێی فەرمانەکانی خودا، مافی دایبابەکانتان داوەو پاراستووە؟ ئایا دڵی دایبابەکانتان لە خۆتان ڕازی کردووە؟ ئایا فەرمانی ئەوانتان جێبەجێ کردووە؟ ئایا ڕێزتان لێ گرتوون؟ ئایا خزمەتی ئەوانتان کردووە؟ ئایا گوێڕایەڵی ئەوانتـــان کردووە؟ ئایا نزاو پاڕانەوەتان بۆ کردووە؟ ئایا لە خێرو چاکـــەی ئێوە بەهرەمەند بوون؟ ئایا دڵی ئەوانتان خۆش کردووە؟ ئایا قەرزی گیانبازیو دڵسۆزیو شـــەونخوونیی ئەوانتان داوەتەوە، کە لەکاتی کۆرپەییو تافی منداڵیدا بە ئێوەی بەخشیبوو؟

هیوادارم بۆ هەر پرســـیارێك، وەڵامێکتان ئامادە کردبێت، بەڵام وا مەزانن بە وەڵامی ســـاختە، یان بە واسیتەو واستەکاری، یان بە بەرتیلـــدان، دەتوانن لەو ڕۆژە دژوارەدا خۆتان ڕزگار بکەن؛ چونکە کەس لەو زاڵگەیە ڕزگاری نابێت، مەگەر کارتی ڕەزامەندیی خودای گـــەورەو دایبابەکانـــی پێبێت، بۆیە با هـــەوڵ بدەین ئەو کارتە لە

دونیادا بەدەست بهێنینو لە کیسی خۆمانی نەدەین؛ چونکە ئەوەی ئەو کارتـەی پێ نەبێـت، ناتوانێت بەرەو بەهەشـتی جاویدانیو هەتاهەتایی بپەڕێتەوەو لە بەهەشتییەکان بێت.

## ئەی مامۆستایانی ئیسلام

ئەی مامۆسـتایانی ئیسـلام، ئێـوە میراتگرانـی پێغەمبەرانن، بڵاوکردنەوەی ئەم دینە پاکە، بە پلەی یەکەم لە ئەستۆی ئێوەدایە، ئێوە پەیامو ئاڵای پیرۆزی ئیسـلامتان هەڵگرتـووە، ئێوەن ڕێگای ڕاسـتو ناڕاسـت، حەڵاڵو حەرام، خێرو شـەڕ، چـاکو خراپ، بۆ خەڵك ڕۆشـن دەکەنەوە، ئێوەن زانایانی مزگەوتو مینەبەر، ئێوەن چاوساغو دەمڕاستی کۆمەڵگەو ئێوەنو ئێوەن و.....

ئایـا دەزانن، بەرپرسـیاریتیی سەرشـانی ئێوەو زۆر سـەختو دژوارە، ئایـا دەزانـن، کە ئێوە لە دونیـاو دواڕۆژداو لە دینی تاك تاکی ئەم میللەتە بەرپرسـیارن؟ ئایـا دەزانن، هەم مافی خوداتان لەسـەرە، هەم مافـی خەڵکیش، ئایا خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە سـەختە ئامادە کردووەو کە خودای باڵادەست لە ڕۆژی هەستانەوەدا فەرمان بە فریشـتەکانی دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ (٢٤) ﴾ الصافات.

ئەو مامۆستایانە ڕاگرنو کە ئەرکی گەیاندنی پەیامی ئیسلامیان لە ئەستۆ دابوو.

بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمانو نازناوی میراتگرانی پێغەمبەرانی

بە ئێوە بەخشیوە، هەر وەك لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: إنَّ العلماءَ ورثةُ الأنبياء). فرواه الترمذي وغيره وصححه الألباني.

واتە: «زاناكان میراتگرانی پێغەمبەرانن».

بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەكرێت. ئایا توێشووتان پێیە بۆ ئەو ڕۆژە سەختو پڕ ئازارە؟!!

ئەی میراتگرانی پێغەمبەران: كاتێك لە ڕۆژی هەستانەوەدا پرسیارتان لێ دەكرێت: ئایا ئێوە وەك میراتەگرانی پێغەمبەر، بەڕاستیو درووستی ئەركی سەرشانتان جێبەجێ كردووە؟ ئایا دینەكەتان بەجوانیو لێزانیو حیكمەت بە هەموو خەڵكی گەیاندووە؟ ئایا گشت هۆكارو ڕێكارێكی پەسەندو گونجاوتان بەكار هێنابوو بۆ بانگكردنی مەردوم بۆ دینی خودا؟ ئایا بەرگریتان لە مافی خوداو خەڵك كردبوو؟ ئایا وەك پارێزەرێكی دڵسۆزو دەستپاكو دڵپاك پارێزگاریتان لە بەها پیرۆزەكان ئیسلام كردبوو؟

ئایا بە كردەوە، ئیسلامتان لە ژیانی خۆتاندا بەرجەستە كردبوو؟ ئایا وەك خودا دەیویست، ئاوا بە حیكمەتو لێزانی بانگی خەڵكتان بۆ ئیسلام دەكرد؟ ئایا ئەوەی كە بە خەڵكتان ڕادەگەیاند لە ئایەتو فەرموودە پیرۆزەكان، بەخۆتان ئەنجامتان دەداو لەسەر خۆتان جێبەجێ دەكرد؟ ئایا ئیسلام وەك خۆی لە گوفتارو ڕەفتارو كردارەكانتاندا بەرجەستە بووبوو؟، یان فەرمانتان بە چاكە دەكرد، یا نا، ئایا نەهیتان لە خراپەو خراپەكاری دەكرد، یان نا؟ ئایا ئێوە لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتییەدا بوون، كە پێتان سپێردرابوو؟ بە كورتیو بە كوردی، لە دونیادا ئێوە بۆ كێ ژیابوون، بۆ خودا، یاخود بۆ دونیا؟!!!!!!!

هەموو ئەم پرسیارانە، مشتێکن لە خەروارێك، بۆیە دەبێت هەر هەمووتـــان خۆتان بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرســـیارانە ئامادە بکەنو وەڵامتان پێ بێت؛ تا لەو ڕۆژە ســـەختەدا، بتوانن کارتی پەڕینەوە بەرەو بەهەشت وەربگرنو لە دۆزەخ ڕزگارتان ببێت.

## ئەی ئەفسەرو پۆلیسو سەربازەکان:

ئـــەی ئەفســـەروپۆلیسو ســـەربازەکان! ئـــەی ئەوانـــەی چەکی شەرەفو کەرامەتو عیززەتتان کردووەتە شانو بەرگریی لە خاكو گەلو نیشتمانو ناموسو سەروەتو سامانی خەڵك دەکەنو بەشەوو ڕۆژ شـــەونخوونی دەکەنو پاسەوانیو پارێزگاریی لە بەها ئایینیو ئەخلاقیو نەتەوەییو نیشتمانییەکانتان دەکەن.

پێغەمبەری خۆشەویســـتمان(ﷺ) لەبارەی ئەو پاسەوانانەی لە پێناو خودادا ئێشکگری دەکەن دەفەرموێت: (عينان لاتمسهما النار، عين بكت من خشـــية الله، وعين باتت تحرس في ســـبيل الله) رواه الترمذي.

واتە: (دوو چاو بە ئاگری دۆزەخ ناســـووتێن، چاوێك لە ترســـی خودا گریا بێت، چاوێکیش لە ڕێی خودادا ئێشکگر بێت).

ڕاســـتە، ئەرکتان زۆر پیرۆزە، بەڵام هەستیارو گرانیشە؛ چونکە هەروەك چـــۆن ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانتان، دەبێتە مایەی شـــانازیو ســـەربەرزیی گەلو نیشـــتمانو بەرقەرارکردنی ئارامیو ئاســـایشو هێمنـــی بۆ تاکـــوو چینەکانی کۆمەڵگە، ئـــاوا هەبوونی هەر جۆرە

خۆدزینەوەو کەمتەرخەمیو خەمساردیو ناپاکیو بێباکییەکیش، لە ئاست ئەرکە پیرۆزەکەتاندا، دەبێتە مایەی شەرمەزاریو ڕیسواییو پەشێویو شەپرزەییو تەنگژەو ئاژاوە و، سیمای جوانیی ژیان دەشێوێنێت!

ئەڵبەتە کارەکەتان ئەمانەتێکە، لە ئەستۆی ئێوەدایە، بۆیە پێویستە ئەو ئەمانەتە بپارێزنو پارێزگاریی لێ بکەن، هەروەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء

واتە: (بەڕاستی خودا فەرمانتان پێ دەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیانو کاتێك دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا، بە داد حوکم بکەن، بەڕاستیی خودا بەچاکی ئامۆژگاریتان دەکات، بەڕاستیی خودا هەمیشە بیسەری بینایە).

پێغەمبەریشمان(ﷺ) لەبارەی سپاردەوو ئەمانەتەوە دەفەرموێت: (أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ) واتە: «سپاردە بۆ ئەو کەسە بگەڕێنەوە، کە بە تۆی سپاردووە».

مەخابن! هەندێك لە ئەفسەرو پۆلیسو سەربازەکان! لەمیانەی ڕاپەڕاندنی ئەرکو کارەکانیاندا، بە مەبەستی وەرگرتنی پارەوپووڵ، یان ئافەرین، یان بەدەستهێنانی پۆستو پلەوپایە، یان خۆشیرینکردن و...تاد. پەنا بۆ کاری حەرام، ناپاك، نارەوا، گزی، بەرتیلوەرگرتن، واسیتەکردن، ماستاوچیێتیو تەنانەت ستەمکاریو تەعداکاریو غەدرو ئەشکەنجەدانو ئازاردانو...تاد. دەبەنو ناپاکی لەگەڵ خوداو خەڵکیدا دەکەن. بەڵێ، ئەوان بەم جۆرە کارە پەستو

فێزەونانــــە، فێـــڵ لە خۆیان دەکەنو خـــۆڵ دەکەنە چاوی خۆیانو خۆیان چەواشەو دەستخەڕۆ دەکەن، نەك خەڵکی دیکە!!

ئەڵبەتە ڕووی قسەکانمان، لەو ئەفسەرو پۆلیسو سەربازانەیە، کـــە ئەنجامدانی ســـتەمو تاوان لای ئەوان شـــانازییە! کە ئازاردانو ئەشـــکەنجەدانی خەڵکی ڕەشوڕووتـو بێتاوان لای ئەوان گیانبازییە! کە پێشـــێلکاریو تەعداکاریو چەواشـــەکاریو مافخۆری، لای ئەوان سەربەرزییە!

بەڵێ، ئەوان چی دەڵێن بۆ ئەو ڕۆژە ترسناکە، کە پەروەردەگاری باڵادەســـتو تۆڵەســـتێن، فەرمان بە فریشـــتەکانی خـــۆی دەکاتو پێیـــان دەفەرموێت: ئـــەو ئەفســـەرو پۆلیسو ســـەربازانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات.

بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایـــا ئەوان بەرگـــەی ئـــەو ڕۆژە ســـەختەو دژوارە دەگرن، کە بەقەدەر پەنجا هەزار ســـاڵی ئـــەم دونیایە درێژە؟! ئایا دەتوانن لە دادگایی خودای تۆڵەستێن، کە خۆی دەبێتە قازیو مافی خەڵك لە ئەوانە دەستێنێتەوە، بەرگری لە تاوانەکانیان بکەن؟! ئایا لەو ڕۆژە سەختەدا، بەرپرسو پلە باڵاکان دەتوانن بەرگرییان لێ بکەن؟! ئایا لەو ڕۆژە سامناکەدا، دەرفەتێکی دیکەیان پێ دەدرێت، کە بگەڕێنەوە دونیاو هەڵەو تاوانەکانیان دووبارەو چەندبارە نەکەنەوە!! ئەڵبەتە نەخێر.

چونکـــە ئەو ڕۆژە پڕئازارو ســـەختە، ڕۆژی خـــاوەن مافەکانە، ڕۆژی چەوسێندراوانە، ڕۆژی غەدرلێکراوانو ڕۆژی بەشخۆراوانە.

بۆیـــە پێش هاتنی ئەو ڕۆژە ترســـناکە، پێش نۆشـــینی جامی

مـــەرگ، پێش ئـــەوەی کار لە کار بترازێت! مەردی خودا بن، کوڕی خۆتـــان مەکەن بە قوربانی کچـــی خەڵك! چیتر ژیانی قیامەت بە ژیانی دونیاو دۆزەخ بە بەهەشت مەگۆڕنەوە! بڕیاری خۆتان بدەن، کە بۆ هەمیشـــە بۆ خودا بژینو بۆ خودا بمرنو بەخوداناســـی لە گۆڕەکانتان هەســـتنەوەو ڕەزامەندیی پەروەردگار بەدەست بهێننو بەهەشتی فیردەوس مسۆگەر بکەن!!

## ئەی فەرمانبەران

ئـــەی فەرمانبەرانـــی میـــریو کەرتـــی تایبـــەت! بێگومـــان ئەنجامدانـــی کارو فرمانی حەڵاڵو پەســـەند، مایـــەی ڕەزامەندیی خوداو دڵخۆشـــکردنی خەڵکـــە، ئەگەر مرۆڤ لـــە ڕاپەڕاندنی کارو فرمانەکانیـــدا، کەســـێکی بەرپرسو دڵســـۆزو دەســـتپاكو دڵپاكو ڕاســـتگۆ بێـــت، هەم لـــە دونیا بەختـــەوەرو دڵشـــاد دەبێتو ڕێزی لـــێ دەگیرێت، هەم لەلای پەروەردگاریش کەســـێکی ستایشـــکراوو ڕێزلێگیراوو پاداشتکراو دەبێت، بەڵام پێچەوانەکەیشی ڕاستە، ئەگەر فەرمانبەر لە ڕاپەڕاندنی کارو فرمانەکانیدا، کەســـێکی نابەرپرس، ناپاك، دەســـتپیسو نانحـــەرام بێت، هەم لە دونیـــا دەکەوێتە بەر نەفرەتی خەڵك، هەم لە قیامەتیشـــدا ڕووڕەشو شەرمەزار دەبێتو ڕەنجبەخەســـار دەبێت، بۆیە پێویســـتە خۆتـــان یەکلایی بکەنەوە، ئاخۆ لە کامە دەستە دەبن؟!

بۆیە پێغەیمبەرمان لەم بارەیەوە لە فەرموودەیەکیدا فەرموویەتی: (من استعملناه على عمل، فرزقناه رزقا فما أخذه بعد ذلك فهو غلول) رواه ابوداود وصححه الترمذي.

واتە: «ئەگەر یەکێکمان کردە کاربەدەست لەسەر کارێکو ئەندازەیەکی دیاریکراومان پێی دا، ئەوەی دوای ئەمە وەری دەگرێت، خیانەتە».

ئەی ئەو فەرمانبەرانەی لە هەر پلەو پۆستێکدانو لە کارەکانتاندا، فێڵو تەڵەکەبازی لە خەڵك دەکەن! ئەی ئەو فەرمانبەرانەی کە لە خودا ناترسێنو لە ڕێی گەندەڵیو ڕەشوەو بەرتیلو واسیتەو واسیتەکارییەوە، قۆڵی خەڵك دەبڕنو مافی خەڵك دەخۆنو ستەم لە خەڵکی دەکەن! ئەی ئەو فەرمانبەرانەی خەمساردیو کەمتەرخەمی لە ئەرکو کارەکانتاندا دەکەنو ڕزقو ڕۆزی خۆتانو ماڵو منداڵەکانتان حەرام دەکەن! ئەی ئەو فەرمانبەرانەی کە سیخوڕی بەسەر ئەمو ئەودا دەکەنو یاسا پێشێل دەکەنو وەکوو کرمێکی زیانبەخش، ئابووریی کۆمەڵگە دەڕزێنن! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بیر لەو ڕۆژە سەختو دژوارە بکەنەوە، کەوا خودای باڵادەست، فەرمان بەفریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو فەرمانبەرانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ (٢٤) ﴾الصافات.

بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

کاتێك لەو ڕۆژەدا، پرسیارتان لێ دەکرێت: بۆچی فێڵتان لەمو لەو کرد؟ بۆچی ڕەشوەو بەرتیلتان وەرگرت؟ بۆچی پارەی خەڵکیتان بەناهەق خوارد؟ بۆچی بەتەواوی دەوامتان نەدەکرد؟ بۆچی ماڵی گشتیتان بەهەدەر دەداو بۆ مەرامی کەسیی بەکارتان دەهێنا؟

بۆچی ئەرکی خۆتان بەجوانیو تەواوی جێبەجێ نەدەکرد؟ بۆچی کارەکانـــی خەڵکتان، بەدادپەروەری ڕایی نەدەکرد؟ بۆچی یاســاتان پێشــێل دەکرد؟ بۆچی ســاختەکاریتان دەکرد؟ بۆچی جیاوازیتان لە نێوان ئەمو ئــەودا دەکرد؟ بۆچی بێفەرمانیی خوداتان دەکرد؟ بۆچی لەگەڵ خوداو خەڵکدا، ڕاســتگۆ نەبوون؟!!و بەدەیان بۆچیو بۆچی دیکە؟؟؟؟!!!!!!!!!!

ئایا وەڵامتان بۆ هەموو ئەو پرســیارانە پێیە، کە ئاڕاســتەتان دەکرێــت؟ ئەگــەر تا ئێســتا، بیرتان لــەو ڕۆژە ســەختو دژوارە نەکردبێتەوە، ئەگەر تا ئێستا، لە خەوی غەفلەتدا بوون! ئەگەر تا ئێســتا، پەیامێکی لەم جۆرەتان پێنەگیشــتبێت؛ ئەوا مەردی خودا بــن هەر ئێســتا بڕیاری خۆتان بدەن، کە لاپەڕەیەکی تازەو ســپی لەگەڵ (خودا)، ئینجا لەگەڵ (خەڵك)دا بکەنەوەو لاپەڕە ڕەشەکەی ڕابوردوو، بە کارە باشــەکانو کردارە خێرەکان بســڕنەوە؛ چونکە دڵنیــا بن، هیچ شــتێك بە وردو درشــتییەوە، بە کــەمو زۆریەوە، بە گــەورەو بچووکییەوە، لای خودای باڵادەســت ون نابێتو کەس لە زاڵگەی ڕۆژی هەســتانەوە قورتــاری نابێت، مەگەر ڕەزامەندیی خــودای بەدەســت هێنابێتو لە دونیادا هەم خــودای لە خۆ ڕازی کردبێت، هەم مافو کەرامەتی خەڵکیشی پاراستبێت.

## ئەی پزیشکان

ئەی پزیشـــکەکان! ئەی ئەوانەی ســـوێندتان بـــە خودای مەزن خـــواردووە، کـــە لە ئاســـت ئەرکـــە پیرۆزەکەتانـــدا کەمتەرخەمی نەنوێنن‌و تا ئەوپەڕی توانا، گیان‌و ژیانی خەڵك لە مردن بپارێزن، هـــەروەك دەزانن، مـــرۆڤ پیرۆزترین‌و ژیرترین‌و هۆشـــمەندترین بوونەوەرە، ئەو مرۆڤەی پلەی جێنشـــینی خودای لەسەر زەوی پێ بەخشـــراوە! ئەو مرۆڤەی کە بە جوانترین‌و شایســـتەترین شـــێوە ئەفرێندراوە، ئەو مرۆڤەی کە خودا هەموو شـــتێکی لەم دونیایەدا بۆ دەســـتەمۆ (مســـخر)کردووە، ئـــەو مرۆڤـــەی ئەمانەتی خودای هەڵگرتووە لەســـەر زەوی، ئەو مرۆڤەی لە ئاســـمان‌و زەوی‌و زەریاو دەریاکاندا، توانی بە بەرزترین پلەی زانســـتو مەعریفە بگات، ئەو مرۆڤەی توانی جوانیی بە ژیان ببەخشێ!

ئەڵبەتـــە پزیشـــکەکان توێژێکـــی هەرەگرنگـــی کۆمەڵگـــە پێك دەهێنن؛ چونکە پاراستنی سەلامەتیی گشت کۆمەڵگە دەگرنە ئەستۆ، بۆیە ڕووی قســـەکانمان لەو پزیشـــك‌و دکتۆرانەیە، کە دڵســـۆزانەو مرۆڤدۆستانە سەرەدەری لەگەڵ پیشەی خۆیان‌و نەخۆشەکان ناکەن.

ئەی ئەو پزیشکانەی تا ئێستا بەرپرسیارێتیی خۆتان جێبەجێ نەکـــردووەو وەك پێویســـت ئاوڕتـــان لـــە نەخـــۆش‌و بیمـــارەکان نەداوەتەوە! ئەی ئەوپزیشکانەی کەم تا زۆر، بازرگانیتان بە خوێنی نەخۆشەکانەوە کردووە! لە ئاست پاراستنی گیان‌و ژیانی نەخۆشەکان

کەمتەرخەمیتان نواندووە! دەستی دەستیتان پێکردوون، دەرمانی ماوەبەسەرچووتان دەرخوارد داون! گرنگیتان بە نەخۆش‌و دەردەدارەکان نەداوە، وەك مرۆڤ سەیرتان نەکردوون، جیاوازیتان لە نێوان ئەم نەخۆش‌و ئەو نەخۆشەدا کردووە، بۆ کۆکردنەوەی پارەوپووڵ، دەسەڵاتەکەتان بەشێوەیەکی خراپ بەکار هێناوە! لەسەر گیرفانی نەخۆش، خۆتان دەوڵەمەندو سەرمایەدار کردووە! چاوتان لە کەموکوورییەکانی هاوکارو هاوپیشەکانتان پۆشیوە! ویژدانتان لە ئاست نێش‌و ئازارەکانی نەخۆشەکاندا نەجووڵاوە!

ئایا دەزانن، کە خودای باڵادەست دەتانبینێت‌و لێتان غافل نییە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ﴿٥﴾﴾ آل عمران: ٥.

واتە: (نە لە زەویی، نە لە ئاسمان، هیچ شتێك لە خودا شاراوە نییە، ئاگاداری هەموو دەغدەغەو خەتەراتی دڵەکانیشە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴿١٩﴾﴾ غافر: ١٩.

واتە: (ئەو خودایە هەمیشە بە چاوە خیانەتکارەکان، بەرامبەر بە نافەرمانی خۆی، دەزانێت‌و بەوەش سینەکان حەشاری دەدەن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿بَلِ الْإِنسَانُ عَلَىٰ نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُ ﴿١٥﴾﴾ القيامة: ١٤ — ١٥.

واتە: (بەڵکوو ئەو ڕۆژە، مرۆڤ لە سەرخۆی شایەتە چی کردووە، چی گوتووە؟ هەرچەندە بە زمانیش بڕوبیانووویەکی زۆر بهێنێتەوەو پاکانە بکات بۆ ڕزگارکردنی خۆی، بەڵام بێسوودەو کەڵکی نییە؛ چونکە خۆی شایەتە لەسەر خۆی).

ئایا ڕۆژێـــك لـــە ڕۆژان، بیرتـــان لـــەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە کردووەتەوە، کەوا بە ڕۆژی هەستانەوەو هەقو حیساب بەناوبانگە، ئـــەو ڕۆژەی کە خودای باڵادەســـت، فەرمان بە فریشـــتەکانی خۆی دەکاتو پێیـــان دەفەرموێت: ئەو پزیشـــکانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

کاتێـــك ئـــەو ڕۆژە هـــاتو هەمووتان لەبـــەردەم پـــەروەردگارا کۆکرانەوەو لەسەر هەموو ئەو کارە قێزەونو ناشیرینانەی سەرەوە، کە ئەنجامتان داوە، پرسیارتان لێ کرا: ئێوە بە چ ڕوویەك وەڵامی پـــەروەردگاری خۆتان دەدەنەوە؟ چۆن خۆتان لـــەو زاڵگەیە ڕزگار دەکـــەن؟ چـــۆنو بەچی نەفســـی خۆتان دەکڕنەوە؟ کـــێ لەو ڕۆژە سەختەدا بەهانای ئێوەوە دێت: پارەوپووڵ، یان کۆشكو تەلار، یان شـــەهادەو ناوبانـــگ؟ کێ دەبێتە کەفیلتان؟ کێ لـــە ئێوە دەتوانێت لـــەو ڕۆژە دژوارەدا، مافـــی ئەو هەموو نەخۆشـــانە بداتـــەوە، ئایا وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەتان پێیە، کە لە یەکە بە یەکەی ئێوە دەکرێت؟!!

هیوادارم ئەگەر تا ئێستاش خەوشیو کەموکووڕیو خەمساردیو بێباکیتـــان، لە ئاســـت نەخۆشـــەکاندا هەبـــووە، ئەگەر تا ئێســـتا بازرگانیتـــان بە خوێـــنو گیانو ژیانی نەخۆشـــەکان کردووە؛ ئەوا دوای وەرگرتنـــی ئەم پەیامە، ئیتـــر لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ خودا، ئینجا لەگەڵ نەخۆشـــەکان هەڵبدەنەوەو چیتـــر توخنی ئەو کارو ڕەفتارو گوفتارانە نەکەون، کە خودای گەورە پێی ناخۆشـــەو لێتان تـــووڕە دەبێتو غەزەبتـــان لێ دەگرێـــتو تۆڵەتان لـــێ دەکاتەوە، هەروەهـــا لەمەودا هەوڵ بـــدەن پردی خۆشەویســـتیو متمانە، لە

نێوان خۆتانو نەخۆشەکانتان درووست بکەنو مافەکانیان بپارێزن؛ تا بتوانن ڕەزامەندیی خوداو مەردوم بەدەست بهێننو ئایندەیەکی پرشنگدارو بەختەوەر، بۆ خۆتان دابین بکەن.

## ئەی ئەندازیاران

ئەی ئەندازیاران! ڕاستە، نەخشەی بیناسازیو تەرلاسازیو شەقامسازیو بەرزەپردەکانو جادەکانو ڕێگاوبانەکانو باڵەخانەکان و...تاد. لەسەر دەستی ئێوە دادەنرێت.. ڕاستە، لە بیناکردنی شارستانیەتدا، ئێوە پشکی شێرتان بەردەکەوێت، ڕاستە ئەندازیارەکان لە سەرتاسەری دونیادا، ڕۆڵێکی کاراو چارەنووسسازیان،لە پێشخستنو بەشارستانیکردنی جیهاندا، هەیە.. بەڵێ، ئەم هەقیقەتانە کەس ناتوانێت نکۆڵییان لێ بکات، کاری هەر کەسێك دەبێتە ناسنامەو شوناسی ئەو، بەڵام هەندێك ئەندازیاری نابەرپرسو بێباك، لەپێناو خۆدەوڵەمەندکردنو پارەخڕکردنەوە، ناپاکی لە کارەکانیاندا دەکەنو کارەکانیان بە شێوەیەکی ستانداردو زانستی ناکەنو بە پێچەوانەی فەرموودەکانی خوداو پێغەمبەری خودا هەڵسوکەوت دەکەن.

چونکە خودای مەزن، کاری تەواوو ڕێکوپێك دەکاتو کارێکمان لێ وەرناگرێت، پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو زاتە بێت.

هەر وەك دەفەرموێت: ﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ النمل: ٨٨.

واتـــە: (ئـــەوەش کاری ئـــەو خودایەیە کە هەموو شـــتێکی زۆر بەرێکوپێکی درووست کردووە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەهەر کارێك، ئێوە بیکەن؛ چاك وخراپ).

هەروەها دەفەرمویـــت: ﴿ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: خەڵکینە! دوای باشـــبوونی ئەم زەوییە، -بە هۆی ناردنی پەیامبەرانەوە «عليهم الصلاة والسـلام» هەرگیز ئیفســـادو خراپەکاری تێد مەکەنو هەمیشـــە بەترسو بە ئومێدەوە لە خودا داوا بکەن، بەڕاســـتی ڕەحمەتو بەزەیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە، جا کە وا بوو ئێوەش هەمیشەو بەپەلە چاکە بکەن.

هەروەها دەفەرمویـــت:﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة: ٧ — ٨.

واتە: (ئینجا هەرکەســێك کێشـــی وردیلەیـــەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە، کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەڕو خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە).

هەروەها پێغەمبەرمـــان(ﷺ) داومان لێ دەکات، کە کارەکانمان بەرێکوپێکی ئەنجام بدەین، بۆیە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى يُحِبّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ). رواه الطبراني

واتـــە: (خودای گـــەورە یەکێکتانی خـــۆش دەوێ، کاتێك کارێك دەکات بەرێکوپێکی ئەنجامی بدات).

ئـــەی ئەندازیاران! ئەی ئەوانەی ناپاکیی لە کارو ئەرکەکانتاندا دەکەن! ئەی ئەوانەی لەگـــەڵ بەڵێندەراندا ڕێککەوتنی ژێربەژێرو

نایاسایی‌و ناشەرعی ئەنجام دەدەن! ئەی ئەوانەی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی کەسی، بەرژەوەندیی گشتی دەخەنە لاوەو مافی میللەت پێشێل دەکەن! ئەی ئەوانەی گەندەڵی لە کارو پڕۆژەکانتاندا دەکەن، پارەوپووڵی میللەتو حکومەت دەدزنو هەڵدەلووشن! دەستی میللەت دەبڕن! سامانی گشتیی بەهەدەر دەدەن! لە پێوەرو ستاندەردەکان لادەدەنو بە هەڕەمەکی کارەکان ڕایی دەکەنو هەڵەکان دەقۆزنەوە بۆ هەر جۆرە فرتو فێڵو چەواشەکارییەك! ئەی ئەوانەی لە ڕێی ڕاستو هەقیقەت لاتان داوەو سۆزو وەفاتان بۆ خاكو گەلو نیشتمان نەماوە.

ئایا نازانن، ژیانی ئەم دونیایە، چەند ساڵو مانگو ڕۆژو کاتژمێرو خولەكو چرکەیەکی کەمن، زۆر بەخێرایی دەگوزەرێن؟ ئایا نازانن، دوای مردن، ڕۆژی هەستانەوە هەیە، ئەو ڕۆژەی کە خودای باڵادەست فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو ئەندازیارە سەرپێچیکارو نابەرپرسانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان ئەوان، پرسیاریان لێ دەکرێت.

کاتێك لەو ڕۆژە سەختەدا، هەمووتان ڕادەگیرێنو بەڕووتوقووتی دێنە خزمەت خوداو لەسەر ئەنجامدانی کارە ناشەرعیو نایاساییەکانتان، پرسیارتان لێ دەکرێتو وەڵامتان لێ وەردەگیرێتو جگە لەو فریشتانەی کە دەفتەری کردەوەکانتانیان لایە، گشت ئەندامانی جەستەشتان، گەواهیتان لەسەر دەدەنو ئەو ڕۆژە دەرفەتی ڕاکردن، یان خۆدزینەوە، یان خۆگرینەوە نییە.. بەڵێ، پەشیمانبوونەوە، لەو ڕۆژەدا، دادی هیچ کەسێك نادات!

بۆیــه مەردی خودا بن، هەر لە ئێســتاوە بڕیاری خۆتان بدەن کە لەو کەســانە بن، کە لە ڕۆژی هەســتانەوەدا، بە ڕوویەکی ســوور دەچنە خزمەت خودای مەزنو نامەی کردارەکانتان بەدەستی ڕاست وەردەگرن.

## ئەی قازیو دادوەران

ئەی دادوەران! هەروەك دەزانن، دادگا شوێنی جیاکردنەوەی هەقو باتڵو ڕاستیو ناڕاستیو چاکەو خراپەیە، شوێنی گەڕاندنەوەی مافە، بۆ خاوەن مافەکان، شوێنی سەروەریی یاسایە، پەناگەی بێپەنایانە، شوێنی سزادانی تاوانبارانو یاسا پێشێلکەرانە، شوێنی گەڕاندنەوەی شــکۆو سەروەرییە بۆ مرۆڤەکانو بەها بەرزەکان، شوێنی بڕیاردانە لەســەر پرســە چارەنووســازەکان، ئەم شــەرەفە مەزنــەش، بە ئێوە ســپێردراوە، بۆیە لادانــی هەر دادوەرێك لە پرەنســیپەکانی قەزاوەتو دادوەری، تاوانێکی مەزنو هەڵەیەکی کوشندەیە؛ چونکە پارێزگاریکــردن لــە مافە ڕەواکانــی تاکوو چینەکانــی کۆمەڵگەو بەرپاکردنــی دادپــەروەری لە زەویدا ئەرکێکە، تەنها لە ئەســتۆی دەسەڵاتداراندا نییە، بەڵکوو لە ئەستۆی ئێوەشدایە.

بۆیە ئەرکی قازیو دادوەران، زۆر سەختو گرانە؛ چونکە ئەگەر قەزاوەتکردنتــان لە نێــوان خەڵکیدا بەدادپــەروەری نەبێت؛ ئەواماڵوێرانیو تیاچوونو شەرمەزارییە،

هــەروەك خــودای مــەزن، دوامان لــێ دەکات کــە فەرمان بە

دادگەریو چاکەکردن بکەین، هەر وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ ﴿٩٠﴾﴾ النحل.

واتــە: (بێگومان خودا فەرمان بەدادگــەریو چاکەکردن لەگەڵ تەواوی درووستکراوەکانیدا دەدا).

هەروەهــا خودای مەزن دوامان لــێ دەکات، کە بەدادپەروەریو چاکــە، قــەزاوەت لە نێــوان خەڵکیدا بکەیــنو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾﴾ النساء.

واتــە: (هەرچی ئەمانــەت بێ؛ بیدەنەوە دەســتی خاوەنەکەی، بێگومان خودا فەرمانتان پێ دەدا، کە هەموو ئەمانەتو سپاردەیەك بدەنەوە دەست خاوەنەکەیو هەرکات دادگایی نێوان مەردوم دەکەن، دادگەرانەو بەیەکســانی داوەریی بکەن، واتە: بەلای هیچ کەســێکدا دامەبــڕن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێــت: (إن الله مع الحاكم ما لم يجر، فإذا جار وكله إلى نفسه) ئيبن ماجه: ٧٧٥/٢.

واتە: خودا پشتگیری لە (دادوەر) دەکات، هەتا ناهەقی نەکات، هەرکــە ناهەقی کرد، خــودا وازی لێ دەهێنێتو دەیداتە دەســتی خۆی! بەڕاســتی خودای بەهەق بەجوانترین شــێوەو، بەشێوازێکی زۆر چــاك، ئامۆژگاریتــان دەکات، کەوابــوو: ئێوە ئەو ســپاردانەی لاتانە، بدەنــەوە بەخاوەنەکانیان، هەمووکاتیــش دادگەرانە بڕیار بدەن، بێگومان خودا هەمیشــە بیســەرە بۆ گشت شتێك، بینایە بۆ دیــارو نادیار. پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمــوێ: (اد الأمانة إلى من ائتمنك، ولا تخن من خانك). پێشەوا ئەحمەد: ٤٠٤/٢.

واتــە: ســپاردە بــدەوە دەســتی خــاوەن ســپاردەکە، هەرگیز

خەیانەتو گزی مەکەن، تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسەشــدا خەیانەتی لێ کردوویت.).

هەروەك پێغەمبەرمـــان(ﷺ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (لْقُضَاةُ ثَلاثَـةٌ: قَاضِيَــانِ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ فِي الْـجَنَّةِ؛ رَجُلٌ قَضَى بِغَـيْرِ الْـحَقِّ فَعَلِمَ ذَاكَ، فَـذَاكَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ لا يَعْلَمُ فَأَهْلَـكَ حُقُوقَ النَّاسِ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ قَضَى بِالْـحَقِّ فَذَلِكَ فِي الْـجَنَّةِ» رواه الترمذی رقم (١٣٢٢) ج٣ ص ٦١٢

واتە: (سێ جۆرە قازی هەیە، دوان دەچنە دۆزەخەوە، یەکێکیان دەچێتە بەهەشتەوە، پیاوێك بەناڕەوا قەزاوەتی کردووەو زانیویەتی کــە حوکمەکەی ناڕەوایە، ئەوە لــە ئاگردایە، هەروەها قازییەکیش نازانێت قەزاوەت بــکاتو مافەکانی خەڵکی بەهەدەر دەدا، ئەویش لە ئاگردایە، قازییەکیش بە ڕاستیو دادپەروەری قەزاوەتی کردووە، ئەو لە بەهەشتدایە).

هەروەها لــە فەرموودەیەکی دیکەدا، ڕوو لە قازییەکان دەکاتو دەفەرموێــت: (إِذَا تَقَاضَى إِلَيْكَ رَجُــلانِ فَلاَ تَقْضِ لِلأَوَّلِ حَتَّــى تَسْمَعَ كَلاَمَ الآخَرِ؛ فَسَوْفَ تَدْرِي كَيْفَ تَقْضِي). رواه الترمذي، رقم (١٣٣١) ج٣ ص ٦١٨

واتە: (ئەگەر دوو کەس، بۆ قەزاوەتکردن هاتن بۆ لات، قەزاوەت بۆ یەکێکیان مەکە، تا گوێ لە دووەمیشیان نەگری؛ بۆئەوەی بزانی چۆن قەزاوەت لە نێوانیاندا دەکەیت).

هەروەها نابێت قازی لە کاتی تووڕەییدا قەزاوەت بکات، هەروەك هــەروەك پێغەمبەرمان(ﷺ)، دەفەرموێت: (لاَ يَقْضِــيَ الحَكَمُ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ). رواه ابو داود، رقم (٣٥٩١) ج٣ ص ٣٣٠

واتــە: (نابــێ قازی لە کاتی تووڕەییدا، قــەزاوەت لە نێوان دوو کەسدا بکات).

بۆیە ڕووی قسـەمان لەو دادوەرانەیە، کە یاسـا وەك لاستیکێك وایـە بەدەسـت حـەزو ئارەزووەکانیانـەوەو بۆ مەرامـی خۆیان بەکاری دەهێنن! ئەوانەی لە هەقو ڕاسـتی لایان داوەو بە پێوەری بەرژەوەنـدی، کارەکانیان ڕاپی دەکەن! ئەوانەی نادادوەری دەکەنو لەپێناو وەرگرتنی کەمێك پارەوپووڵ، یان بەدەستهێنانی پلەوپایەو دەسـتکەوت، سـتەم لە سـتەملێکراو دەکەنو بەرگری لە ستەمکار دەکەن! ئەو دادوەرانەی بەشـدارن لە زیادبوونی تاوانو کەتنەکان! ئەو دادوەرانەی ترسی خودا لەناو دڵیاندا نییەو مافی خوداو مافی خەڵـك پێشـێل دەکەن! ئایا کاتی ئـەوە نەهاتووە بیـر لەو ڕۆژە بکەنـەوە، کە خودا تێیـدا دەبێتە دادوەرو ئێوەش وەك تاوانبار لە دادگای پەروەردگاردا دادگایی دەکرێن؟!!

خۆتان سـازو ئامادە کردووە، بۆ ئەو ڕۆژە سـەختو دژوارە، کە پـەروەردگار فەرمان بە فریشـتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو دادوەرە ئابەرپرسـانە ڕاگـرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا کێ هەیە لەو زاڵگەیە دەربازتان بکات؟ پارە، یان دەسەڵات، یان ناوبانگ، یان پۆلیس و...تاد؟

ئایـا بـە هەگبەیەکی پڕ لـە تاوانەوە دەتوانـن بەرگەی ڕۆژی هەسـتانەوە بگـرن، کە هێنـدە ناخـۆشو سـەختو دژوارەو بە قەدەر(٥٠٠٠٠) ساڵێ دونیایە؟!!

ئایا دەتوانن لەو ڕۆژە سامناکەدا دادوەری بۆ تاوانەکانتان بکەنو خۆتان لە مافەکانی خەڵك ببوێرن؟!!

بۆیە هێشتا کارلەکارنەترازەوە، هێشتا گیانتان نەکێشراوە، هێشتا

دەرفەتتان لەبەردەمدا ماوە، هێشــتا دەفتــەری کارو کردەوەکانتان نەپێچراوەتــەوە، هێشــتا لەم دونیایــە فانییە بارتــان نەکردووە، مــەردی خودا بن، بگەڕێنەوە بۆ لای پــەروەردگار، دەرگای خودای گەورە هەمیشــە کراوەیە، لە قاپی خودا بدەنو ســوود لە ســۆزو میهرەبانی پەروەردگار وەربگرنو واز لە ستەم وتاوان بهێننو کارتی ڕەزامەندیی خودای دلۆڤان بەدەســت بهێننو ژیانێکی چەند ڕۆژی بە ژیانێکی هەمیشەیی مەگۆڕنەوە.

## ئەی پارێزەرانو مافپەروەران

ئەی پارێزەرانو مافپەروەران! ئێوە پەرژینو پارێزەری مافەکانن! ئێــوە بەرگریــکاری مافخوراوەکانــن، کاتێك مافی خەڵك پێشــێل دەکرێت، کاتێك چەواشــەو دەستخەڕۆ دەکرێن، کاتێك ستەمیان لێ دەکرێت، کاتێك بەشــێوەیەکی ناڕەوا دەست بەسەر موڵكوماڵیاندا دەگیرێــت! کاتێــك لە ناســت وەرگرتنەوەی مافــو بەشــەکانیاندا، دەستەوەســتانو دۆش دادەمێنن، ڕاستەوخۆ پەنا بۆ ئێوە دەهێنن؛ چونکە یاســاو دەستوور ئەو مافەی بە ئێوە بەخشیوە، کە بەرگری لەو کەســانە بکەن، کە مافیان خوراوە، ستەمیان لێ کراوە، قۆڵیان بڕاوە، جەرگیان ســووتاوە، هێزیان لێ بڕاوە! بۆیە مەلەکردن دژی ئەو شەپۆلە، واتە: دیزە بەدەرخۆنەکردنی ڕاستییەکانو پێشێلکردنی مافەکانو سەرخستنی تاوانبارەکان.

خودای مەزن، داوامان لێ دەکات، کە فەرمان بە دادگەری بکەینو

له نادادپەروەری دوور بکەوینەوە، هەر وەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ ﴿٩٠﴾ ﴾ النحل.

واتـــه: (بێگومان خودا، فەرمان بە دادگەریو چاکەکردن لەگەڵ تەواوی درووستکراوەکانیدا دەدا).

هەروەهـــا پێغەمبەرمـــان (ﷺ)، داوامان لـــێ دەکات، کە کارەکانمان بەرێکوپێکی ئەنجام بدەین، بۆیە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (إنّ الله تعالى يُحبّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ). سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم ١٠٦/٣، ١١١٣.

واتە: (باری تەعالا حەز دەکات، ئەگەر کارێکتان کرد؛ بەوردیو رێکوپێکی بیکەن).

ئەی ئەو پارێزەرو مافپەروەرانەی کە لە رێڕەوی ڕاســـتەقینەی خۆتان لاتان داوە! لەبری ئەوەی ببنە پارێزەرو ســـەرخەری هەقو ڕاستیو ماف بۆ خاوەن مافەکان بگێڕنەوە، بەرگری لە ستەملێکراوان بکەن، ڕێگە لە ســـتەمکاران بگرن؛ تا چیتـــر قۆڵی خەڵك نەبڕنو مافی خەڵك نەخۆنو گاڵتە بە چارەنووسی مرۆڤەکان نەکەن!!

خۆتـــان دەبن بە برابەشـــی مافخـــۆرو ســـتەمکارەکانو خۆتان ڕاســـتییەکان دەشـــێوێننو مافـــەکان پێشـــێل دەکەنو لـــە ڕێگەی نایاســـاییەوە، هـــەق دەکەن بە ناهـــەقو ســـتەملێکراو دەکەن بە ســـتەمکار، ستەمکاریش دەکەن بە ستەملێکراو، لە پێناو وەرگرتنی هەندێك ئیمتیازی مادی، یاســـا پێشێل دەکەنو بەرگری لە مافخۆر دەکەنو مافی مافخوراو هەڵدەلووشن!!

سەری لێ دەشـــێوێنن، چاوبەســـتی دەکەن، لەگەڵ فێڵباز دەبن بە هاوشـــانو هاوڕێو خەڵکی ســـادەو ســـاکارو بێتاوان دەستخەڕۆو لەخشتە دەبەن.

ئـــەی ئەو پارێـــزەرو مافپەروەرانەی کە تەنگتـــان بە هەژارانو لێقەوماوانو ستەملێکراوانو بەشـــخۆراوان هەڵچنیوە!! ئەم هەموو تاوانانە، لەپای چی؟! تا کەی، ئاشی تاوان دەهاڕن؟ تاکەی ویژدانتان ناجووڵێتو پێتان ناڵێت بەســـە تاوان. بەســـە چەواشەکاری، بەسە بەرگریکـــردن لە ناهەقو ســـتەمکار، بەس خواردنـــی ماڵی خەڵك بەناڕەوایی؟!

ئایا بیرتان لەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە نەکردووەتەوە، کە ڕۆژی هەســـتانەوەیە، ئـــەو ڕۆژەی هێندە مەترســـیدارە، چـــاوەکان تێیدا ئەبڵـــەق دەبنو ئافرەتە دووگیانـــەکان، کۆرپەکەیان لەبار دەچێتو منداڵ لەترسا پیر دەبێت!!

ئایـــا بیرتـــان لـــەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە نەکردووەتـــەوە، کە پەروەردگار فەرمان بەفریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئـــەو پارێزەرە ســـاختەکارنە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرســـیاریان لێ دەکرێت. ئایا نازانن، لەو ڕۆژە سەختو دژوارەدا مافی ستەملێکراو لە ستەمکار دەسەندرێتەوە، هـــەروەك خودای مـــەزن، لەم بارەیـــەوە دەفەرموێت: ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الانعام.

واتە: (ئینجا ئەوانەی کە ناهەقیو ســـتەم پیشەیان بوو، هەموو خێروخۆشـــیەکیان لەکیس چووو دوابڕاوبوون، ســـوپاسو ستایشی بێپایانیش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانەکانە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ ﴾ طه.

واتـــە: (بێگومـــان کێ ســـتەمی کـــردو هەڵی گـــرت زیانمەندو نائومێدە).

جا کێ لە ئێوە، دەتوانێت پاساو بۆ کارە ناپاسایی‌و ناشەرعییەکانتان بهێنێتەوە؟! کێ دەتوانێت فێڵ لە خودا بکات (پەنا بەخودا)؟ کێ دەتوانێت بۆ تاوانەکانی خۆی ببێتە پارێزەرو وەك مافپەروەرو پارێزەرێك بەرگری لە ستەم‌و تاوانەکانی خۆی بکات؟!

بێگومان کەس لە ئێوە، ناتوانێت لە بەردەم بارەگای خودادا وەك چۆن لە دونیا بەرگریتان لە باطل‌و ناهەقی دەکرد، ئاوا بەرگریش لە ناهقییەکانی خۆتان بکەن؛ چونکە خودای بالآدەست، زاناو بیناو بیسەرە بە هەموو شتێك، نە ستەم لەکەس دەکات، نە مافی کەس زایە دەکات، نە لە مافی ستەملێکراوان بێدەنگ دەبێت‌و خۆش دەبێت، هەروەها دەفتەری کردەوەکانتان، لای فریشتەکانی خودا پارێزراوە، ئەندامەکانی جەستەتان، گەواهیان لەسەر دەدەن، مافخوراوەکان دێن، داوای مافی خۆیان لە ئێوە دەکەن، ئایا لەو ڕۆژە سەختەدا، دەتوانن ڕابکەن‌و خۆتان ڕزگار بکەن؟!! نەڵبەتە نەخێر.

بۆیە هەرچی زووە، دەستبەرداری کارە تاوانکارییەکانتان بن‌و لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ خوداو بەندەکانی خودا بکەنەوەو چیتر توخنی ستەم‌و تاوانی ماڵی حەرام‌و چڵکن مەکەون؛ تاکوو بتوانن کارتی ڕەزامەندیی خودا بەدەست بهێنن‌و لە دۆزەخییەکان نەبن‌و دەستەی بەهەشتییەکان بن.

## ئەی ماموستایان

ئــەی ماموســتایان! ئایا دەزانن، ئێوە داگیرســێنەری بلێســەی زانســتو مەعریفەن لە ولاتــدا، ئێوە بکوژی تاریکــیو دەبەنگیو نەزانیــنو نەفامیو نەخوێندەوارین لە نیشــتماندا، ئێوەن خەڵکی لــە نەزانینەوە، بــەرەو زانایيو تێگەیشــتنو پێگەیشــتن دەبەن، ئێوەن گەلان بەرەو لوتکەی پێشــکەوتنو سەرکەوتن دەبەن، ئێوەن قەلای شارســتانیەتو ژیار بنیاد دەنێن، ئێوەن منداڵە ڕۆحسووکو چاوگەشــەکان، فێــری دەســپاکی، دڵپاکــی، زمانپاکــی، داوێنپاکی، دەروونپاکی، ڕاســتگۆیی، ئەمانەتپارێزی، لێبوردەیی، بەخشندەییو گشــت سیفەتە بەهادارەکان دەکەنو وەك مۆمێك دەتوێنەوە؛ تاکوو ڕووناکی بەگەڵو نیشتمان ببەخشنو دیمەنەکانی ژیان بڕازێننەوە.

بــەلام خۆدزینەوە لــە ئەرکــە پیرۆزەکەتــان، ناپاکیکردن لە پیشەکەتان، هەڵگەڕانەوە لە سۆزو بەڵێنەکەتان، کەمتەرخەمیکردن لــە جێبەجێکردنــی بەرپرســیارێتییەکەتان، نەك هەر نیشــانەی پرسیار لەســەر ناوبانگەکەتان درووســت دەکات، بەڵکوو لە چاوی هەموو خەڵکێکی ویژدانزیندوودا، بچووكو ســووكو ڕیســوا دەبنو شەرمەزاری دونیاو قیامەت دەبن.

چونکە گزییکردن لە کارو پیشــە، مەترسیی لەسەر بیروباوەڕی مرۆڤی موســڵمان درووســت دەکات، هەر وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێت: (من غشنا فليس منا) اخرجه مسلم في صحيحه (١٤٦).

واتە: (ئەوەی فێڵمان لێ بکات، لە ئێمە نییە).

ئەی ئەو مامۆســـتایانەی کە ئەرکی پیرۆزی سەرشانتان ئەنجام نـــادەن! ئەی ئەو مامۆســـتایانەی کە ناپاکی لـــەو ئەمانەتە دەکەن، کە دایبابەکانو حکومەتو کۆمەڵگە ڕادەســـتی ئێوەیان کردووە! ئایا دەزانن، کەســـێك باوەڕی نییە کە ئەمانەتی نەبێت، هەروەها دینی نییە، کە پەیمانشکێن بێتو بەڵێنەکانی خۆی نەباتە سەر؟ هەروەك پێغەمبەرمان(ﷺ)دەفەرموێت: (لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ، وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ). رواه الطبرانی فی المعجم الأوسط، رقم(٢٦٠٦)ج٣، ص ٩٨

ئـــەی ئەو مامۆســـتایانەی کـــە بەرژەوەندیی کەســـی، دەخەنە ســـەرووی بەرژەوەندیـــی گشـــتییەوە! ئـــەی ئـــەو مامۆســـتایانەی کـــە مافی قوتابی دەخـــۆنو کاتەکەی لێ دەدزنو لەگەڵی ڕاســـتگۆ نیـــن! ئەی ئەو مامۆســـتایانەی کە نادادپـــەروەری دەکەن لە نێوان قوتابییەکانتانداو لەســـەر بنەمای حەزو ئارەزووو میزاجی کەسی، مامەڵەو هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەن! ئەی ئەو مامۆستایانەی لە گوفتار، ڕەفتارو کردارتاندا، نموونەیەکی ناشیرینو ناڕاست پیشانی قوتابیـــان دەدەنو هـــۆکارن بۆ بەلاڕێدابردنـــی قوتابیانو کۆمەڵگە بەگشتی! ئەی ئەو مامۆستایانەی جیاوزیی نێوان گوفتارو کردارتاندا، هێندەی دووریی نێوان ئاســـمانو زەوییە! ئەی ئەو مامۆســـتایانەی لە ئامانجـــە فێرکاریو پەروەردەیـــەکان دوور کەوتوونەتەوە! ئەی ئەو مامۆســـتایانەی قوتابیان فێری ئاکاری ناپەسەندو خووڕەوشتی ناشـــیرین دەکەن! ئەی ئەو مامۆســـتایانەی خۆتان لە ئەرکو کارو بەرپرسیارێتی ســـەرەکیی خۆتان دەدزنەوەو لە ڕێبازی پەروەردەو فێرکردنو تێگەیاندنو پێگەیاندن لاتان داوە!

ئایـــا خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە ئامـــادە کردووە، کە

پەروەردگار، فەرمان بەفریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئـــەو مامۆســـتا نابەرپرسو ئەرکنەناســـانە ڕاگـــرن ﴿ وَقِفُوهُمۡ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا وەڵامتان پێیە بۆ یەکە بە یەکەی پرسیارەکانی پەروەردگار؟ بـــۆ ئەو ناپاکییەی کە لەگەڵ قوتابیو دایبابو حکومەتو کۆمەڵگە کردووتانە؟ بۆ ئەو بێباکیو خەمســاردیو کەمتەرخەمییەی کە لە ئـــەرکو پیشـــەکەتاندا کردووتانە؟ بۆ ئەو کاتەی کـــە لە قوتابیان کوشتووتانەو دزیوتانە؟ بۆ ئەو پارە حەرامەی کە لەبڕی پیشەکەتان وەرتان گرتـــووەو بەقەدەر ئەو پارەیە کارتـــان نەکردووە؟ بۆ ئەو نادادپەروەرییەی کە لە نێوان قوتابییەکانتاندا کردووتانە؟ بۆ ئەو چەوشەکارییانەی کە ئەنجامتان داوەو بۆ ئەو، بۆ ئەو و...تاد.

ئایا دەزانن، دادوەر لەو ڕۆژە ســـەختەدا، خـــودی پەروەردگارە، کە زاناو دانایە بە هەموو شتێکو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێتو مافسێنو هەقوەرگرە لە مافخۆرو ستەمکار! بۆیە خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە ئامادە بکەنو هەر لە ئێستاوە بڕیار بـــدەن، بە دڵێکی چـــاکو پاکەوە، بگەڕێنەوە بـــۆ لای پەروەردگارو کۆتایـــی بە هەموو ئەو گوفتـــارو ڕەفتارو کردارو کارانە بهێنن، کە دەبنە مایەی شـــەرمەزاریو ڕووڕەشی دونیاو قیامەتو تووڕەبوونی پەروەردگار.

چونکە تەنها بە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوداوەند، دەتوانن کارتـــی چوونە بەهەشـــت وەربگرنو لە ئاگری بڵێســـەداری دۆزەخ بهێنە پاراستن.

## ئەی قوتابیان

ئــەی قوتابیان، ئێوە دوارۆژو ئاییندەی ئەم گەلو ولاتەن! ئێوە خوێنی تازەن لەناو جەســتەی کۆمەڵگەدا، پێشکەوتنو سەرکەوتنو تێگەیشــتنو پێگەیشــتنی کۆمەڵگە، پەیوەســتە بە ڕادەی کۆششو تەقەلاکانی ئێوەوە، کەواتە: هەموو میللەت چاوی لە دەستو بازووو هیممتبەرزی ئێومیە، جڵەوی کاروانی زانســتو فێربوون لەدەســت ئێوەدایە، ئالآی شــکۆداری زانســتو مەعریفە بەدەست ئێومیە، بە ڕووخانــی ئێــوە، میللەت دەڕووخێــت، بە بەزینی ئێــوە، میللەت دەبەزێــت، بە پاشــکەوتنی ئێوە، میللــە دوا دەکەوێت، بە دابڕانی ئێــوە لە کاروانی زانســتو زانیــاریو پێشــکەوتن، کاروانی گەلو نیشــتمان، لە جیهانی پێشــکەوتوو دادەبڕێتو لە دۆڵە تاریکەکاندا دەمێنێتــەوە! مانەوەتان بە نەزانینو دەبەنگیو کاڵفامی، کۆمەڵگە بــەرەو هەڵدێر دەباتو بەها بەرزەکانــی مرۆڤایەتی، دەکەونە ناو مەترسییەوە! بەڵێ، ئەمە ئەرکو کارو بەرپرسیارێتیتانە، هەمبەر گەلو نیشتمانو مرۆڤایەتی.

ئــەی ئــەو قوتابیانەی کــە ڕێز لە مافــی دایبابو مامۆســتاو هاوڕێکانتان ناگرن، ئەی ئەو قوتابیانەی بە چاوێکی سووك سەیری هەوڵو کۆششی دایبابو مامۆستاکانتان دەکەن، ئەی ئەوقوتابیانەی کە بەزەییتــان بە دایبابەکانتاندا نایەتەوە، ئــەی ئەو قوتابیانەی کە ڕەنجو ماندووبوونی دایبابو مامۆستاکانتان بەهەند وەرناگرن! ئەی ئەو قوتابیانەی کە ڕێز لە دایبابو مامۆستاکانتان ناگرن! ئەی

ئـــەو قوتابیانەی کە لـــە کاتی تاقیکردنـــەوەدا قۆپیە دەکەنو فێڵ لـــە خۆتانو مامۆســـتاو دایبابـو حکومـــەتو کۆمەڵگە دەکەن! ئەی ئەو قوتابیانەیکە لە ڕاپەڕاندنی کارو ئەرکەکانتاندا، کەمتەرخەمی دەکەنو خەمســـاردن! ئەی ئـــەو قوتابیانەی کە زانســـتو زانیاری بەلاتانەوە گرنگ نییەو وەك گوێزژماردن وایە! ئەی ئەو قوتابیانەی کە خۆتان لە ئەرکەکەتـــان دەدزنەوەو جێبەجێی ناکەن، ئەی ئەو قوتابیانەی کە یاساو ڕێساکانی قوتابخانەو ماڵەوەو کۆمەڵگە پێشێل دەکـــەن! ئەی ئـــەو قوتابیانەی کە بە شـــێوەیەکی نابەرپرســـانەو نابەجێ هەڵسوکەوت لەگەڵ دایبابـو مامۆستاو هاوڕێکانتان دەکەن! ئـــەی ئەو قوتابیانەی کە پەنا بۆ گوفتارو ڕەفتارو کرداری ناشـــیاو دەبنو هەســـتی دایبابـو مامۆســـتاو هاوڕێکانتـــان بریندار دەکەن! ئەی ئەو قوتابیانەی کە کات دەکوژنو ڕێز لە کات ناگرنو شـــەوو ڕۆژەکانتان بە شتی پڕوپووچ دەگوزەرێنن!

ئایـــا نازانـــن، کـــە پێغەمبەرمـــان(ﷺ)، داواتـــان لـــێ دەکاتو دەفەرموێت: (اغْتَنِمْ خَمْسًـــا قَبْلَ خَمْسٍ: شَـبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَـقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُـغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ) اخرجه الحاكم والمنذري.

واتە: (پێنج شـــت، پێش هاتنی پێنج شـــت بە دەرفەت بزانەو بیقـــۆزەرەوە: گەنجێتیت پێـــش پیربوونت، تەندرووســـتیت پێش نەخۆشـــکەوتنت، دەوڵەمەندیت پێش هەژاربوونت، دەســـتبەتاڵیت، پێش سەرقاڵبوونت، ژیانت، پێش مردنت).

هەروەها ڕوو لە هەموو موسڵمانێك دەکاتو پێیان دەفەرموێت: (إِنْ قَامَتِ السَّـــاعَةُ وَبِيَدِ أَحَدِكُمْ فَسِـيلَةٌ، فَإِنْ اسْـتَطَاعَ أَنْ لَا يَقُومَ حَتَّى يَغْرِسَهَا

فَلْيَفْعَلْ) صححه الألباني.

واتە: (ئەگەر قیامەت هەستاو نەمامێك بەدەست كەسێكتانەوە بـوو، ئەگـەر توانی ئەو نەمامـە بچێنێت، پێش ئـەوەی قیامەت هەڵبستێت، با بچێنێت).

بۆیـە ئەگەر ئێـوە لە خەوی غەفلەت بەخەبـەر نەهاتنو ئەم ڕۆژە دژوارە بەسـەرتاندا هـات، چـۆنو بـەچ شـێوەیەك وەڵامی پەروەردگارتـان دەدەنـەوە؟! كاتێك فەرمان بەفریشـتەكانی خۆی دەكاتو پێیان دەفەرموێت: ئـەو قوتابییە بێباكو كەمتەرخەمانە ڕاگـرن ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومـان، ئەوانـە پرسیاریان لێ دەكرێت.

كە لە ئەركەكانیاندا بەرانبەر پاراستنی مافەكانی خودا، ئیسلام، دایبابـو مامۆستاو كۆمەڵگە كەمتەرخەمییان نواندووەو پشتیان لە زانستو داهێنان كردووە!

كاتێـك لە بـەردەم پـەروەردگارو دایبابـو مامۆسـتاو هاوڕێو هاوپیشـەكانتاندا ڕادەگیرێـنو لەسـەر كارە وردو درشـتەكانتان هـەقو حسـابتان لەگەڵـدا دەكرێـت، هەڵەكانتـان، تاوانەكانتان، گزییەكانتان، كارە ناشیرەنەكانتان، قسە زبرو هەستبریندارەكانتان لە شـریتێكی ڤیدۆییدا دەخرێتە ڕوو! ئایا دەتوانن وەڵامی هەموو ئـەو پرسـیارگەلانە بدەنەوە؟! ئایا نازانن، هیچ شـتێك لای خودا زایـە نابێت، تەنانەت ئەگەر بە قـەدەر تۆزقاڵێكیش بێت، هەروەك دەفەرموێـت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة.

واتە: (ئینجا هەر كەسـێك كێشـی وردیلەیـەك چاكەی ئەنجام

دابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە، کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەڕو خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە).

بۆیە پێویستە بە گەیشتنی ئەم پەیامە، بە خۆتاندا بچنەوەو بەڵێن بە خودا، ئینجا بە دایبابو مامۆستاو هاوڕێکانتان بدەن، کەوا جارێکی تر ناگەڕێنەوە سەر ئەو ڕێڕەوە چەوتەو ڕێبازێك هەڵدەبژێرن، کە بەهۆیەوە بتوانن ڕەزامەندیی خودا، ئینجا مرۆڤەکان بەدەست بهێننو گوڵێکی بۆنخۆشو گەش بن لەناو باخچەی ژیانو ڤیانداو لە ڕۆژی هەستانەوەشدا، بە دیداری خوداو بەهەشتی بەرین شاد ببن.

## ئەی نووسەرانو ڕۆژنامەنووسان

ئەی نووسەرانو ڕۆژنامەنووسان، ئایا دەزانن، بابەتی نووسین لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکان، یان لە ماڵپەڕە ئەلکترۆنییەکان، یان لەسەر کاغەز، وەك (کتێب، نامیلکە)، هەم ئەرکە، هەم بەرپرسیارێتیشە؛ چونکە نووسین لەسەر دیاردە نەرێنیو ئەرێنییەکان، لەسەر خاڵە باشو خراپەکان، لەسەر تاوانو سەرپێچییەکان، لەسەر شکاندنی یاساو ڕێساکانی ژیان، لەسەر دیمەنە دڵتەزێنەکان، لەسەر ڕووداوو بوویەرە سەرنجڕاکێشەکان، نووسین لەسەر پێداویستیو جوانکارییەکانی ژیان، نووسین لەسەر چەسپاندنو پاراستنی بەها بەرزو پیرۆزەکان، نووسین لەپێناو پێشکەوتنو سەرکەوتنو بنیادنانی شارستانییەت، نووسین

لەپێنــاو نەهێشــتنی نەزانین، نەفامــی، دەبەنگــی، دواکەوتوویی، پاشاگەردانی، گەندەڵی، چەواشــەکاری، لاساری، جیاکاری، هەژاری، نەداری، ســتەمکاری، بێــدادیو فورغکاریو...تاد. نەك هەر گرنگە، بگرە پێویستیشــە؛ چونکــە ئەم جۆرە نووســینانە، هۆکارگەلێكو هاندەرێكن بۆ بێداربوونو وشــیاربوونەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە لە خەوی غەفلەتو هەســتانەوەو ســەرلەنوێ بنیادنانەوەی ژێرخانی هزری، زانستی، کۆمەلایەتی، مەعریفیو کەسێتیی خۆی.

بەلام هەر جۆرە دەرچوونو لادانێك لە پرەنسیپەکانی نووسینو گۆڕینی ئەو ناڕاســتەیە بــەرەو تاریکیو لێژی، نــەك هەر خودی نووســەر زەرەر دەکات، بگــرە کۆمەڵگەش بــەرەو هەڵدێر دەباتو دیمەنەکانــی ژیانو ڤیانو ســازان دەشــێوێنێو بەنزیــن بەئاگردا دەکاتو تەڕو وشــك پێکەوە دەستووتێنێو کوتری ئاشتیو تەباییو ئاسوودەیی لە ئاسمانی بێگەردی ولاتەکەمان دەتۆرێنێ.

بێگومــان مرۆڤ هەر شــتێك لــە دونیا بڕوێنێــت، لە قیامەت دەیدوورێتەوە، ئەگەر قسەی خێر بچێنێت، لە دوارۆژدا بۆی دەبێتە زادو زەخیــرەو لە پردی صیــرات ڕزگاری دەکات، هەروەك خودای مەزن لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ﴿٢٤﴾ ﴾ ابراهيم.

واتــە: (ئەرێ تــۆ نازانــی، کە خودا چــۆن مەســەلو نموونە دەهێنێتەوە بۆ وشــەیەکی پاكو خێردارو سوودبەخش، کە ڕیشەو ڕەگیــی لەنێو زەوییــدا جێگیربووبێو لقو پۆپەکەشــی چووبێت بەئاسماندا).

بەلام لە هەمان کاتدا، خودای بالادەست قسەی خراپو زیانبەخش

بـــە درەختێكی ناپاكو پیس دەهێنێتەوە، هـــەر وەك دەفەرموێت:
﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ ابراهیم.

واتە: (ئەوجا نموونەی وشـــەی پیسو ناپاكو بێخێرو بەرەكەت (شـــیرك) وەكوو درەختێكی پیسو ناپاكو بێســـوودە، بە ڕیشكەوە هەڵكێشـــرابێو لەســـەر زەوی فڕێ درابێ، مانەوەو قەراریی نەبێ، جا شیركو بێباوەڕیش، هەرچەندە كێوو دەشتو دەریاكان پڕ بكاو بیكاتە هەراوهۆســـە، بەو درەختە پیسەیە دەچێت، كە بەڕیشكەوە هەڵكێشـــراوەو فڕێ دراوەتە ســـەرزەوییو ناجێگیرە؛ چونكە هیچ ئەســـڵو بنەمایەكی نییە كە بەڵگەی ژیریو زانســـتی پشتگیری لێ بكات).

بۆیە ڕووی قســـەكانم لە ئێوەیە، ئەی نووسەرو ڕۆژنامەنووسە بەرژەوەندخوازەكان! ئەی نووســـەرو ڕۆژنامەنووســـە ماســـتاوچیو پانكـــەرەوەكان! ئـــەی نووســـەرو ڕۆژنامەنووســـە زمانلـــووسو كردارنەزۆكـــەكان! ئەی ئەو نووســـەرو ڕۆژنامەنووســـانەی جوێن دەبەخشنەوەو بوختان بۆ ئەمو ئەو هەڵدەبەستن، ئەی ئەو نووسەرو ڕۆژنامەنووسانەی زمانتان وەك شمشێر تیژە بۆ زامداركردنی هەستی خەڵكی بێتاوان، ئەی ئەو نووسەرو ڕۆژنامەنووسانەی قەڵەمەكانتان بۆ ڕاستیو هەقیقەتو پاراستنی بەها بەرزەكانو مافو ئازادییەكان ناخەنە كار! ئەی ئەو نووسەرو ڕۆژنامەنووسانەی چاو لە ڕاستییەكان دەنووقێننو ستایشـــی ناپاكیو نادادمەندیو گەندەڵیو ســـتەمكاری دەكەن، ئەی ئەو نووســـەرو ڕۆژنامەنووســـانەی بـــۆ لەتێك نان، بۆ كەمێـــك پارە، بـــۆ هەندێك ئافەرین، بۆ تۆزێـــك ئیمتیاز، ویژدانی

خۆتان دەفرۆشن‌و چاوەکانتان لە ئاست دیتنی ڕاستییەکان دادەخەن، گوێیەکانتان لە ئاست بیستنی هەقیقەتەکاندا کەڕ دەکەن، زمانتان لە ئاست خستنەڕووی ڕاستییەکاندا لاڵ دەکەن! ئەی ئەو نووسەرو ڕۆژنامەنووسـانەی پێ لە ویژدانتان ناوەو خەریکی چاندنی تۆوی دڵڕەشـیو ناکۆکیو ناتەباییو نەسازان‌و لێکترازانن! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، بۆ لای پەروەردگاری جیهانییان بگەڕێنەوەو واز لەو کارە بەدو ناشـیرینانەتان بهێنن؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، لاپەڕەیەکی تـازە لەگەڵ پەروەردگار بکەنەوە، ئایـا کاتی ئەوە نەهاتووە بڕیار بدەن، کەوا هیچ کاتێك بەشێك نەبن لە تاوان‌و شەڕ، چیتر بەشێك نەبن لە کێشـەو ئاژاوەنانەوە، چیتر نەبن بە ژەهرێکی کوشندە بۆ ڕۆحی ژیان‌و ڤیان!

ئایا تا ئێستا بیرتان لەو ڕۆژە سەخت‌و دژوارە کردووەتەوە، کەوا پەروەردگاری بالادەست فەرمان بەفریشتەکانی خۆی دەکات‌و پێیان دەفەرموێت: ئەو نووسـەرو ڕۆژنامەنووسانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ الحجر.

واتـە: (سـوێند بە پـەروەردگارت ئەی موحەممـەد! (ﷺ) لە هەموان دەپرسـین، لەو کارو کردەوەیە دەیانکردو چۆنیش وەڵامی پێغەمبەرەکانیان دەدایەوە)؟

ئایـا زادو زەخیرەو توێشـووتان بۆ ئەو ڕۆژە سـامناك‌و دوورو درێژە ئامادە کردووە؟ ئایا بۆ هەموو ئەو پێشـێلکارییانەی سەرەوە وەڵامی ڕاست‌و درووستتان پێیە؟ ئایا دەتوانن وەڵامی پەروەردگاری

خۆتان بدەنەوە؟!

بەرسف (وەلام)ەکە بۆ ئێوە جێ دەهێڵم!!!!

بـــەلام حەز دەکـــەم، ئەوە بزانن، کـــەوا دەرگای ڤاپی ڕەحمەتی خودا هەمیشـــە بۆ ئەو بەندانە لەسەر پشـــتە، کە بە دڵێکی پاکو بەدڵســـۆزییەوە بۆ لای پەروەردگاریـــان دەگەڕێنەوەو واز لە تاوانو گوناهەکانیان دەهێننو دەبنە مایەی خۆشیو کامەرانی بۆ خۆیانو گشت مرۆڤایەتی، بۆیە هیوادارم لەم نیعمەتە بێبەش نەبن.

## ئەی هونەرمەندو گۆرانیبێژەکان

ئەی هونەرمەندو گۆرانی بێژەکان، هەمووومان ئەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە چـــاك دەزانین، کە هونەر پێناسو شوناســـی میللەتانە، میللەت بەهۆی فەنو هونەرەوە پێش دەکەوێو دەناســـرێ، هونەری ڕەســـەن خزمەتێکی مـــەزن بە کۆمەڵگەو گەلو نیشـــتمان دەکاتو جوانی بە ڤیانو ژیان دەبەخشـــێت، هونەر پەیامی ئاشتیو ئازادیو تەبایيو لێبوردەییو پێکەوەژیانی پێیە بۆ هەموو جیهان.

بۆیـــە لادان لەم پەیامەو گۆڕینی ئـــەو ناوەڕۆکە، وێڕای ئەوەی هونەر ناشـــیرین دەکات، ناوی سازگاری خۆشەویستیو ژیانیش لێڵ دەکاتو مەلەکردن تێیدا دەبێتە هۆی خنکانو نغرۆبوون.

بۆیـــە پەیامەکەمان، بۆ ئەو هونەرمەنـــدو گۆرانیبێژانەیە، کە بە هونەرو گۆرانییە بێماناو بێتامەکانیان، دیمەنە ڕاستەڤینەکانی ژیان دەشـــێوێنن، هونەرەکەیان هۆکارێکە بۆ بەلاڕێدابردنی خەڵك بەگشـــتیو گەنجان بەتایبەتـــی، لە ڕێگەی هونەرێکـــی بێپەردەوە،

بەنزین بە ئاگردا دەکەنو هەوڵ دەدەن خەڵك بەرەو تاوانو گوناهـ بەرن، لەپێناو وەرگرتنی نەختێك پارەوپووڵ، یان ناودەرکردن، یان بەدەســتهێنانی پلەوپایە، یاخود دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکی کەسی، هونەر تێکەڵ بە ژەهر دەکەنو دەرخواردی گەنجانی دەدەن، ئەی ئەو هونەرمەندو گۆرانیبێژانەی کە سواری شەپۆلەکانی وێڵیو ســەرگەردانی دەبن، ئایا ئامانجو مەبەستەکانی هونەر، وروژاندنی گەنـــجو لاوەکانە بەرەو زەلکاوی تاوانو گونـــاه، یاخود ڕێگەیەکە؛ بۆئەوەی جوانترو باشـــتر لە مەغزاکانی ژیان تێ بگەنو باشـــترو پوختەتـــر پـــێ بگـــەن؟ ئایـــا پەنابردن بـــۆ بەکارهێنانـــی پەیفی هەســـتبزوێنو ورووژێنەر، خزمەت بە هونەرو مرۆڤ دەکات؟ ئایا هونەر بەرپرســـیارێتی نییە؟ ئایا هەر هونەرمەندێكو گۆرانبێژێك هەم لە دونیا، هەم لە قیامەت، لە کاری خۆی بەرپرس نییە؟

ئایا نازانن، هەر قسەیەك لە زارتان دەربچێت، لەسەرتان حسابە؟ هەروەك خودای تۆڵەستێن لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ ق.

واتە: (بۆ گشت وتەیەك، چاودێر هەیەو دەینووسێت).

ئایـــا کاتـــی ئەوە نەهاتـــووە، بیر لە مـــردنو قۆناغەکانی دوای مردنیش بکەنەوە؟! ئایا بیرتان لە ژیانی دوای مردن کردووەتەوە، یان نا؟! ئەو ڕۆژە پڕ هەورازو لێژەی کە پەروەردگاری باڵادەســـت، فەرمان بە فریشـــتەکانی خـــۆی دەکاتو پێیـــان دەفەرموێت: ئەو هونەرمەندو گۆرانیبێژە لاســـارو سەرەڕۆو چەواشەکارەکان ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت، کە پەشێویو بەدڕەوشتییان بڵاو دەکردەوە بە زەویدا،

هــەروەك خودای باڵادەســت، لــە قورئانی پیــرۆزدا دەفەرموێت:
﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم.

واتە: (پشــێوی، واتە: برســێتیو قاتوقرییو گرانیی، نائەمنیو خنكانو نەخۆشــیو بوومەلــەرزە لە بەژو دەریــادا بەدیار كەوت، بەهۆی تاوانو گوناهی خەڵكەوە.. دەبا هەندێ تاڵاوی كردەوەكانیان پێ بچێژێ، بەڵكوو هۆشێك بكەنەوەو پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە لای خودا).

كاتێــك كــە لــە زاڵگــەی پــەروەردگار ڕادەگیرێــنو دەفتەری كردارەكانتــان پــەڕ بــە پــەڕو دێــڕ بــە دێــڕو وشــە بە وشــە هەڵدەدرێتــەوەو دەخوێندرێتەوە، ئایــا گەرەنتی ئەوەتان هەیە كە لــەو زاڵگەیە ڕزگارتان دەبێتو هەروەكوو دونیا، شــا بە ســەپانی خۆتان نازانن! یاخود ئەوێ شوێنێكە، كەس فریای كەس ناكەوێتو كــەس ئامادەنییــە، تۆزقاڵێك لە خێرو چاكەكانــی خۆی بدات بە كەســێكی دیكە؛ چونكە لەو ڕۆژە سەختەدا هەمووومان پێویستیمان بە خێرو چاكە هەیە، تا تەرازووی چاكەكانمان قورســتر بێتو لە ئاگری دۆزەخ نەجاتمان بێت.

بۆیــە ئــەم دونیایــە، شــوێنی تاقیكردنەوەیــە، بــەڵام ڕۆژی هەســتانەوە (قیامەت) شوێنی وەرگرتنی ئەنجامەكانە، بۆیە مرۆڤ چــی بچێنێــت، ئەوە دەدوورێتــەوە، خۆ ناكرێت مــرۆڤ لە دونیا دڕك بچێنێــتو لە قیامەت گــوڵ بچنێتەوە!! بۆیە با هەوڵ بدەین لــە كێڵگەی دونیــادا، تۆوی خێر بڕوێنین؛ تــا ڕەزامەندیی خوداو بەهەشت بدوورینەوە.

## ئەی بازرگانو فرۆشیاران

ئەی بـــازرگانو فرۆشـــیاران! بێگومـــان کاری بازرگانیو کڕینو فرۆشـــتن، لە چوارچێوەیەکی شەرعیو یاساییو ئاساییدا، نەك هەر کارێکی پەســـەندو باشە، بەڵکوو لای پەروەردگار، خێرو پاداشتیشی هەیە؛ چونکە بەهۆی ئەو کارەوە، هەم پێداویســـتیو بژێوی ژیانی خۆتـــانو مـــاڵو منداڵەکانتان دابیـــن دەکەن، هەمیشـــە یارمەتیی خەڵکـــی دەدەنو لـــە تەنگو چەڵەمەکانی ژیـــان ڕزگاریان دەکەنو ژیان ئاڕاستەی ڕاستەقینەی خۆی وەردەگرێت، هەموو لایەکیش لە خێروبێری بازرگانیو کڕینو فرۆشتن، بەهرەمەند دەبێت.

ئایا دەزانن، کاتی خۆی هەندێك وڵاتی کیشـــوەری ئاســـیا، وەك مالیزیاو ئەندونیسیاو پاکســـتانو...تاد لە ڕێگەی ئەخلاقو مامەڵە جوانو ڕاستو درووســـتەکانی بازرگانە موسڵمانەکانەوە هاتوونەتە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، بۆیە ڕۆڵی بازرگانێکی موسڵمان لە ڕۆڵی مامۆستایەکی ئایینی کەمتر نییە، ئەگەر زیاتر نەبێت.

بەڵام کارەسات لەوەدایە، کاتێك بازرگانیکردنو کڕینو فرۆشتن دوور لـــە ویژدانو بەها پیـــرۆزەکانو بنەما ئایینییـــەکان ئەنجام دەدرێـــتو هەندێك لە بازرگانو فرۆشـــیاران دەکەونە داوو تەڵەی بێویژدانیو هەلپەرستیو خۆویستیو دویناویستیو لە خوداپەرستیو مرۆڤدۆستیو ژیاندۆستیو ڤیانپەروەری دوور دەکەونەوەو ڕێچکەی شەیتان دەگرنو دەستخەڕۆ دەبن!!!!

خـــودای مەزن، لـــە قورئاندا ئاماژە بە کەســـپی حەرام دەکاتو

باسـی ئەو جۆرە کەسـانە دەکات، کە حەڵاڵەکان حـەرام دەکەنو حەرامەکانیـش حەڵاڵ دەکەن، هەروەك دەفەرمویّت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ یونس.

واتە: (بڵێ: ئاخـۆ ئەو ڕزقو ڕۆزییەی کە خودا دای بەزاندووە بۆتان، ئەوجا ئێوەیش بەئارەزووی خۆتان بەشێکی قەدەغەو حەرام دەکەنو بەشێکیشـی حـەڵاڵ؟! بڵێ: ئاخۆ خـودا ئیزنی داون، ئاوا بکەن؟ نەخێر، بوختانو درۆ لەسەرخوا هەڵدەبەسن!).

هەروەهـا پێغەمبەری خۆشەویستیشـمان(ﷺ)، لـەم بارەیەوە فەرموویەتـی: (يأتي على الناس زمـان لا يبالي المرء ما أخذ منه، أمن الحلال أما لحرام) رواه البخاري.

واتە: (ڕۆژگارێك بەسـەر خەڵکیدا دێت، پیاو باکی نییە، لەوەی بەدەستی هێناوە، ئاخۆ حەڵاڵە، یان حەرامە).

هەروەهـا لەبـارەی فرتو فێـڵو حیلەبـازیو تەڵەکەبازییەوە دەفەرموێت: (من غشنا فليس منا) أخرجه مسلم في صحيحه (١٤٦).

واتە: (ئەوەی فێڵمان لێ بکات، لە ئێمە نییە).

لەم سـۆنگەیەوە، ڕووی قسەکانمان لەو بازرگانو فرۆشیارانەیە، کـە لە کڕینو فرۆشـتندا ڕاسـتگۆ نیـنو پەنا بۆ کاری سـاختەو تەڵەکەبازیو چەواشـەکاری دەبـەن، واتە: بـە پارەیەکی حەرامو چڵکن، لەسـەر حسابی کەسـانی دیکە، گیرفانی خۆیان پڕدەکەنو کۆشكو تەلار بنیاد دەنێنو کێڵگەو باخچە دەڕازێننەوەو ئۆتۆمبێلی ئاخـر مۆدێل لێ دەخوڕنو فیز بەسـەر خەڵکیدا دەکەنو پۆز لێ دەدەنو خۆیان لە خەڵکانی دیکە، پێ گەورەترە.

ئەی ئەو بازرگانو فرۆشـــیارانەی لە کڕینو فرۆشتندا، ستەم لە کڕیار دەکەنو مافی پێشـــێل دەکەنو ڕاســـتییەکانی لێ دەشارنەوە، زۆربـــەی جار فێڵی دەبڕنو پـــارەو دراوەکەی بەناڕەواو بەحەرامی هەڵدەلووشن!!

کاڵاو شـــتومەکە خراپـــەکان، بە بەهایەکی ئـــەرزان دەکڕنو بە بەهایەکی گرانو بە چەند قات، بە کڕیارەکانی دەفرۆشنەوە، بەبێ ئەوەی ویژدانتان بێتە قسەو لۆمەتان بکاتو بەئاگاتان بهێنتەوە!

ئـــەی ئەو بـــازرگانو فرۆشـــیارانەی خۆراکی ماوەبەســـەرچوو، دەرخواردی خەڵك دەدەنو پێیان دەفرۆشن!! شتە بەسەرچووەکانتان بە ڕێگەیەکی ناشەرعیو نایاسایی ساغ دەکەنەوە.

ئەگەر تا ئێستا، نەکەوتوونەتە ناو تۆڕی یاساوە، ئەگەر تائێستا ویژدانتـــان نەجووڵاوە، ئەگەر ڕۆژی هەســـتانەوەتان لەبیر نەماوە! ئەگەر تا ئێستا بڕیاری تەوبەو پەشێمانبوونەوەتان نەداوە، هەرگیز مەڵێن باوی ئەم جۆرە قســـانە نەماوە؟! زوو فریای خۆتان بکەون، هێشتا کار لە کار نەترازاوە.

واتە: ئیمڕۆ ژیانە، سبەی مردنە، ئیمڕۆ دونیایە، سبەی پەسلانە، ڕۆژی تاقیکردنەوەیە، ســـبەی ڕۆژی وەرگرتنـــەوەی ئەنجامی کارو کردەوەکانە.

ئایـــا بیرتان لەوە کردووەتەوە، کە دوای مردن، زیندووکردنەوە هەیـــە؟! ئایـــا خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە حازر کردووە، کە پەروەردگاری باڵادەســـت فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو بازرگانو فرۆشیارە فێڵبازو فێڵبڕانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرســـیاریان

لێ دەکرێت.

بەڵێ، لەو ڕۆژە ســەختەدا، پەروەردگار خــۆی دەبێتە دادوەرو ئێوەش وەك تاوانبارو قۆڵبڕو یاساشــكێنو ساختەكارو گرانفرۆشو مافخۆر لە بەردەمیدا ئامادە دەبن، لەو ڕۆژەدا، ئێوە ناتوانن بەدینارو دۆلارو كۆشكو تەلار، خۆتان بكڕنەوەو گەردەنی خۆتان ئازاد بكەنو لەو زاڵگەیە ڕزگارتان بێت؛ چونكە ئەو ڕۆژە، ڕۆژی هەقو حسابو لێپرســینەوەیە، ڕۆژی گەڕاندنــەوەی مافە، بــۆ مافخوراوان، ڕۆژی ســەندنەوەی تۆڵەیە لە ســتەمكاران، ڕۆژی ئاشــكراكردنی حیلەو فرتو فێڵو تەڵەكەبازیو ســاختەكاریو شــتە شاردراوەكانە، ڕۆژی خستنەڕووی ڕاستییەكانە.

لــەو ڕۆژەدا، هەمــوو كەســێك كارە بــاشو خراپەكانــی، كارە وردو درشــتەكانی، كارە ســپیو ڕەشــەكانی، كارە خێرو شەڕەكانی دەبینێتەوە.

بۆیــە مەردی خودا بن، پێش ئەوەی مــردن یەختەتان بگرێتو پەلكێشــی نــاو گۆڕتــان بكات، كۆتایــی بەو هەمــوو كارە حەرامو ناپەســەندو ناشەرعییانە بهێنن كە دەبنە مای تووڕەبوونی خوداو چەوســاندنەوەی خەڵك؛ تاكوو ئێــوەش بتوانن، ڕەزامەندیی خودا بەدەست بهێننو كارتی چوونە بەهەشت وەربگرن.

# ئەی دەوڵەمەندو سەرمایەداران

ئەی دەوڵەمەندو سەرمایەداران! هەمووومان ئەو ڕاستییە چاك دەزانین، کەوا سەرمایەو پووڵو پارە، پێداویستییەکی سەرەکیی ژیانە؛ چونکە ژیان بەبێ سەرمایەو پووڵو پارە بەڕێوە ناچێتو ناسووڕێت، واتە: کەس کێشەی لەگەڵ خودی پارەو سەرمایەدا نییە، بەڵکوو کێشەکە، لەگەڵ ئەو کەسانەدایە، کە پارەیان بە دەستەوەیەو دەوڵەمەندو سەرمایەدارن، ئاخۆ ئەو پارەو سەرمایەیە، بۆ کاری خێرو چاکەو بۆ تێرکردنی سکی برسیو هەژارانو پەنادانی بێپەنایانو خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بەکار دەهێننو پارەو سەرمایەکەیان، دەخەنە خزمەت خۆیانو هەموو جیهانی مرۆڤایەتی، یاخود دەبنە پارەپەرستو کۆیلەی پارەو دینارو دۆلارو کۆشكو تەلار؟

مخابن! هەندێك لە پارەدارو سەرمایەدارەکان، پارەیان کردووەتە ئاغاو کوێخاو خۆشیان بوونەتە سەپانو خزمەتکاری! لەبری ئەوەی پارە خزمەتیان بکات، خۆیان خزمەتی پارە دەکەن، لەجیاتی ئەوەی لە ڕێگەی پارەو سەرمایەوە، کاری خێرو چاکەو مەردایەتیو جوامێری بکەن، بۆ ئەنجامدانی تاوانو گوناه بەکاری دەهێننو ڕۆژبەڕۆژ، ڕەسیدی تاوانەکانیان زیاد دەکەن! ئەو جۆرە کەسانە، پارە لەناو ناخو دڵیاندا، هێندە خۆشەویستە، شوێنی خۆشەویستیی خودا، ئایین، گەل، نیشتمانو مرۆڤی گرتووەتەوەو مرۆڤبوونی خۆیان لە بۆتەی پارەدا تواندووەتەوە!

ئەی ئەو دەوڵەمەندو سەرمایەدارانەی کە پارە لای ئێوە، هەمموو شـــتێکە، چاوداخستن لە ئاست ڕاستییەکانی ژیاندا، خۆ گەمژاندنو خۆگێلکردنە!!

ئایـــا نازانـــن، ئەم ژیانـــە ژیانێکـــی کاتییە، ئـــەم ژیانە چەند ڕۆژو مانـــگو ســـاڵێکن، دێنو دەچنو دەگوزەرێـــن! کەس لە دونیا بـــە جاویدانـــی نەماوەتەوە؛ تاکـــوو ئێـــوە تێیدا بمێننـــەوە، ئایا قاروونـــەکانو فیرعەونـــەکان لە کوێن؟ زۆرێك لەوانەی کە ســـەد قات لە ئێوە دەوڵەمەندتر بوون، ڕەســـیدێکی بێشـــوماریان هەبوو، ئێســـتا لەناو سکی زەویدا، خۆراکی مشـــكو مارەکانن! یاخود لەناو قووڵایی دەریاکاندان؛ لە ناو سکی حووتو نەهەنگو ماسییەکاندان! زۆرێك لەو کەســـانەی کە شانازییان بە پارەوپووڵەوە دەکرد، ئێستا هێسکوپرووسکەکانیشـــیان ڕزیوەو بەشێکن لە خاكو گڵ! ئایا هیچ وانەیـــەك هەیە لە وانەی مەرگ گەورەتر بێت؛ تاکوو مرۆڤە ژیرو هۆشـــمەندەکان پەندی لێ وەربگرن؟!! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، لە خودا بترسێنو بگەڕێنەوە بۆ لای خودا؟!

ئایا ترســـتان لەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە نییە، کە پەروەردگاری باڵادەست، فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت؛ ئەو دەوڵەمەندو سەرمایەدارانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا خۆتان، بۆ ئەو دادگایە ئامادەکردووە، کە خودی پەروەردگار، دەبێتە دادوەرو یەکە بە یەکەی ئێوە، لەســـەر پووڵو پارەو دینارو دۆلارەکانتـــان دادگاییتـــان دەکاتو پرســـیارتان لـــێ دەکات، ئاخـــۆ پارەکەتـــان لە کوێ هێنابـــوو؟ ئایا بەحەرامی دەســـتتان کەوتبوو،

یان بەحەلاڵی؟ ئایا بەحەلاڵی خەرجتان کردبوو، یان بەحەرامی؟! ئایا برسـیو هەژارەکانتان تێر کردبوو، ئایا بێکەسو ڕووتەکانتان پۆشـتە کردبوو؟ ئایـا بێپەنـاو بێنەوایەکانتان پەنـا دابوو، ئایا نەخۆشـەکانتان یارمەتی دابوو؟ ئایا کارو پڕۆژەی خێرتان ئەنجام دابوو؟! ئایا بەشـی خـوداو هـەژارو نەدارەکانتان لـە ماڵەکەتان دەرهێنابوو؟!! ئایا دەسـتی قەرزدارەکانتان گرتبوو؟! ئایا یارمەتیی خێزانە لێقەوماوەکانتان دابوو؟!!

بەڵێ، هەندێك سـەرمایەداری چاوچنۆك لە دونیادا، جاڕی شەڕ دەکەن لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی، بە پەنابردنیان بۆ سووکردنو پـارە بە قەرزنەدان بە هـەژارو نەدارەکان، هەروەك خودای مەزن، لە قورئاندا ئاماژە بەم ڕاسـتییە دەکاتو و دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة.

واتـە: (ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتان هێنـاوە! دەبێ بەتەواوی ملکەچـی فەرمـانو قەدەغەکراوەکانـی خـودا بـن»و لە گشـت سـنوورەکانی پارێز بکـەن و، لە پاشـماوەی سوودەکەشـتان- کە بەلای ئەمو ئەووەوەیـە واز بهێننو، داوای مەکەن ئەگەر باوەڕداری ڕاسـتەقینەن، دەبێـت گوێڕایەڵی تـەواوی فەرمودەکانی خودا بن، لەو سـوودەش بێدەنگ بن، خۆ ئەگەر واتان نەکردو دەسـتتان لە سوودخۆری هەڵنەگرت، ئەوسا جەنگێکی گەورە ڕابگەیەنن، لەگەڵ خوداو پەیامبەرەکەیدا (ﷺ)؛ چونکە سـوودخۆری، دژایەتیکردنی فەرمانەکانـی خـوداو پێغەمبـەری خودایە، واتە: سـوودخواردن،

ئیعلانــی جەنگــە لەگەڵ خــوداو پێغەمبــەردا، ئەگەر دەســت لە ســوودخۆری هەڵگرنو پەشیمان ببنەوە لێی، ســەرمایەكانی ماڵی خۆتــان بەتەنهاو (بێســوود) بســێننەوە لە قــەرزارەكان، ئیتر نە ئێــوە لە قەرزارەكان ســتەم كەن، واتە: «زیــاد لە ماڵەكەی خۆتان وەرمەگرنەوە»، نە لەلایەن ئەوانیشــەوە ستەمتان لێ بكرێ، «هەر بەو جۆرە، كە كەمتر لە سەرمایەكەتان بدرێتەوە»

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان، هەڕەشە لەو دەوڵەمەندو ســەرمایەدارانە دەكات، كــە شــەو بەتێروتەســەلی دەخــەونو هاوسێیەكانیشیان بەبرســێتی ڕۆژ دەكەنەوەو دەشزانن كە برسیو بێنــانو حاڵن، هەروەك دەفەرموێت: (مَا آمَنَ بِي مَنْ بَاتَ شَــبْعَانَ وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يَعْلَمُ بِهِ).

واتــە: (بــاوەڕی پــێ نەهێنــاوم ئــەوەی تێروتەســەل بێــتو هاوسێكەیشی بە تەنیشتییەوە برسیی بێتو بشزانێت).

بەڵــێ، نەك هەر ئەم پرســیارانە، بەڵكوو بە ســەدانو هەزاران پرســیاری دیكەتان لــێ دەكرێت، بۆیە فریای خۆتــان بكەونو واز لــە دونیاپەرســتی بهێننو هەڕن بۆ كۆڕی خوداپەرســتان! چونكە مرۆڤ چەند دەوڵەمەندو سەرمایەدارو تەنانەت ملیاردێریش بێت، لە ئاســت گەنجینەكانی خودادا هەر فەقیرە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ فاطر.

واتە: (ئەی خەڵكینە! ئێوە هەژارنو نیازتان بە خودا هەیە، ئەو بێنیازو سوپاسكراوە، هەرچەندە خەڵكی ململانێ بكات).

بەڕاســتی ئەو كەســانەی خودایان هەبێت؛ ئەوا بەسیانە، بەڵام ئەگــەر خودایان نەبێت، ئەگەر هەموو دونیــا موڵكی ئەوان بێت،

دادیان نەداتو لە ڕۆژی هەستانەوەدا، پەنجەی پەشێمانی دەگەزنو خۆزگە بە کاری خێرو چاکەو سەدەقەکانی دونیا دەخوازن؛ چونکە کە لەدەستیان دەرچوو، ئیدی مەحاڵە جارێکی دیکە ئەو دەرفەتەیان بۆ بگەڕێتەوە؛ چونکە کاتی تاقیکردنەوە تەواو بوو، ئیدی کاتی ئەنجام وەرگرتنەوەیە!!

## ئەی نوێنەرانی خەڵك

ئەی نوێنەرانی خەڵك! ئەو ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە، بڕواو متمانەی خەڵکیتان بەدەست هێناوەو هەڵبژێردراون؛ بۆئەوەی ئەو کارنامەو نەخشەڕێگەیە جێبەجێ بکەن، کە لەکاتی هەڵبژاردندا، بانگەشەتان بۆ دەکرد! ئایا دەزانن، نوێنەرایەتی ئەرکو بەرپرسیارێتییەکی مرۆڤی، ئایینی، ئەخلاقی، نەتەوەییو نیشتمانییە؛ چونکە ئێوە تەنها نوێنەری خۆتان نین، بەڵکوو نوێنەری هەموو ئەو خەڵکانەن، کە دەنگیان بە ئێوە داوە، جێبەجێکردنی ئەو سۆزو بەڵێنانە، کە لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا بە خەڵکیتان داوە، ئەرکێکی ئەخلاقییە، جێبەجێنەکردنیشی نادڵسۆزیو ناپاکییە.

ئایا نوێنەرایەتیکردنی خەڵك، ئەمانەتێك نییە لە ئەستۆتاندا؟ ئایا لێپرسینەوەو لێپێچینەوەتان لەگەڵدا ناکرێت؟ ئایا خودای بالادەست نافەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٢٧ ﴾ الأنفال.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ناپاکی مەکەن لەگەڵ خـوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وە ناپاکی مەکەن لە سـپاردەکانی ناو خۆتان، لە کاتێکدا ئێوە دەزانن ناپاکییە).

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: (مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْـتَرْعِيهِ اللّٰهُ رَعِيَّـةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُـوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ إِلاَّ حَـرَّمَ اللّٰهُ عَلَيْهِ الْجَنَّـةَ). رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (٦٧٣١)، ومسلم (١/٨٧/ ٣٨٠)، وابن حبان في "صحيحه"(٤٤٩٥).

واتە: (هیـچ بەندەیەك نییە، کە خودای پـەروەردگار دەیکاتە بەرپـرسو گەورەو دەسـەڵاتدار، ئەو ڕۆژەی کـە دەمرێت، گزیو ناپاکیی کردووە لە ژێردەسـتەکانی؛ ئەوا خودای گەورە، بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات).

مخابن! زۆرێك لەو کەسـانەی دەبن بـە نوێنەرانی(گەل)! هەر زووبەزوو، خۆیان لەبیر دەچێتەوەو سـۆزو بەڵێنەکانیشـان لەبیر دەکـەن، هەروەهـا نـەو وەعدو بەڵێنانـەش ناهێننـە دی، کە بە جەماوەرەکەیان دابوو! لەسەر حسابی ئەمو ئەو، خۆیان دەوڵەمەند دەکەن! لە کەسـانێکی سادەو ساکارو خاکییەوە دەبن بە کەسانێکی بەفیزو دەعیەو خۆبەزلزان! لە کەسانێکی هەژارو نەدارەوە دەبن بە کەسـانێکی دەوڵەمەندو سەرمایەدار، لە کەسانێکی کۆمەڵایەتییەوە دەبن بە کەسـانێکی گۆشەگیرو دوورەپەرێز، لە کەسانێکی سەخیو مەردەوە، دەبن بە کەسانێکی ڕەزیلو دەستقۆچاوو چاوچنۆك!

ئایـا ئەو نوێنەرانەی کـە نابەرپرسـانە کار دەکەنو گەمە بە چارەنووسـی خەڵکـی دەکـەن، بیر لـەوە ناکەنەوە، کـەوا ڕۆژی هەسـتانەوەو هەقو حسـاب هەیە؟! ئایا تـرسو بیمیان نییە لەو ڕۆژە؟! کاتێك پەروەردگاری باڵادەست، فەرمان بەفریشتەکانی خۆی

دەکاتو پێیـان دەفەرموێت: ئـەو نوێنەرانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا لەو ڕۆژە سەختە ناترسێن، کە خودای تۆڵەستێن، مافخۆرو مافخوراوانو ستەمدیدەو ستەمکاران پێکەوە کۆ دەکاتەوەو حسابیان لەگەڵـدا دەکاتو ماف بۆ خاوەنمافـەکان دەگەڕێنێتەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکـە، تەنانەت مافی بزنێکی بێشـاخیش، لە بزنێکی شـاخدار دەسـتێندرێتەوە!! ڕۆژێکە، دەفتەری کـردارەکان دەخوێندرێتەوە! ڕۆژێکـە، خەڵکی مافخوراو، داوای مافی خـۆی دەکات، ئەو مافەی کـە لەلایەن ئێـوەوە خۆراوە! ڕۆژێکە هەرچی لـەم دونیایە کراوە لـە حیلەو فرتو فێڵ، لە ناپاکیو تەڵەکەبازی، لە هەڵخەڵەتاندنو لەخشتەبردن، لە مافخواردنو پێشێلکردن، لە وەعدو بەڵێن شکاندنو ...تاد. هەر هەمووی پەردەی لەسـەر لا دەدرێتو ئاشـکرا دەبێتو ستەمکارو ملهوڕەکان ڕیسـواو شەرمەزار دەبنو پەنجەکانی خۆیان دەگـەزن، بەڵام ئەم پەشـێمانبوونەوەیە دادیان نادات؛ چونکە لەو ڕۆژەدا دادوەری هەمـوو دادوەران کـە (الله)، دادوەری دەکاتو ماف بـۆ خاوەن مـاف دەگێڕێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئـەو مافە بەقەدەر تۆزقاڵێکیش بێت، چاوپۆشی لێ ناکات!!

بۆیە مەردی خودا بن، لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ خوداو جەماوەر هەڵ بدەنەوەو کاری خێرو چاکە لە تۆماری تەمەنتان تۆمار بکەن، پێش ئەوەی تۆماری کردارەکانتان بپێچرێتەوەو بەرەو ماڵی دوایی بار بکەنو ماڵئاوایی یەکجارەکی لە دونیای فانی بکەن.

## ئەی خاوەنکارەکان

ئەی خاوەنـــکارەکان! هەروەك دەزانین کارو ئیش، ســەرچاوەی ژیــانو بژێــویو خۆشــگوزەرانییە، ژیان بەبــێ کارو ئیش بەڕێوە ناچێتو هیچ واتایەك نابەخشــێت، جگە لە مشەخۆریو گەندەیی، بۆیە ئەنجامدانی هەر کارێکی یاســاییو شــەرعی، نەك هەر باشە، بەڵکــوو هــەم لای خودا، هەم لای خەڵکیش پیرۆزو ستایشــکراوەو وەك خێرو چاکە وایە، بکەری کارەکە، پاداشتی لەسەر وەردەگرێتو لە دونیاو قیامەتدا، پلەوپایەی پێ بەرز دەبێتەوەو هەم لای خودا، هەم لای خەڵکیش ڕێزدارو خۆشەویســت دەبێت، بەڵام هەر کاتێك ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدات، یاســاییو شەرعی نەبوو، یان خودا پێــی خۆش نەبوو، یاخــود زیانی بۆ مرۆڤو کۆمەڵگە هەبوو؛ ئەو کاتە هەم کارەکە جێی پەسەند نابێت، هەم بکەرەکەیشی لای خوداو خەڵکی، خۆشەویســت نابێت، بگرە دوچاری ســزاو سەرزەنشتکردن دەبێتەوەو دەکەوێتە بەر نەفرەتی خەڵكو تووڕەییو غەزەبی خودا.

مخابــن، زۆرن ئــەو خاوەنکارانەی کە پەنا بــۆکاری نابەجێو ناشەرعی دەبەنو خۆڵ دەکەنە چاوی خەڵكو لە ڕێگەی ئەو جۆرە کارانەوە، پارەوپووڵ کۆ دەکەنەوەو کۆشكو تەلار درووست دەکەنو بــاغو کێڵگە دەڕازێننەوەو دوچاری خۆبەزلزانیو لووتبەرزی دەبن! زۆرن ئەو خاوەنکارانەی خۆیان لە دانی بەشی خوداو بەشی هەژارو نــەدارەکان دەدزنــەوە؛ نە زەکاتــی ماڵی خــودا دەدەن، نە خێرو سەدەقەو چاکەشی پێ دەکەن، نە دەستی هەژارانو نەداران دەگرن،

نە لە پرۆژەی خێرخوازیدا بەشداری دەکەن.

بەڵێ، زۆرن ئەو خاوەنکارانەی ستەم لە کرێکارەکانی خۆشیان دەکەنو مافیان دەخۆنو ئەو بڕە پارەیەی پێیان دەدەن، زۆر کەمترە لەو کارەی کە پێیانی دەکەن.

بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)، لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (أعطوا الأجير اجره قبل أن يجف عرقه)، وفي رواية: (حقه) بدل (أجره) رواه ابن ماجه، وصححه الألباني.

واتە: (پاداشتی کارکەر بدەن، پێش ئەوەی ئارەقی نێوچەوانی وشك ببێت، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا، «مافی» لە بری پاداشتی هاتووە).

هەروەها لەبارەی ستەمکردن دەفەرموێت: (اتقوا الظلم فإن الظلم ظلمات يوم القيامة.. الحديث) رواه مسلم.

واتە: (خۆتان لە ستەمکردن بپارێزن؛ چونکە ستەمکردن تاریکایی گەلێکە لە ڕۆژی دواییدا).

هەروەها دەفەرموێت: (كل المسلم على المسلم حرام دمه وماله وعرضه) رواه مسلم في صحيحەو صححه الالباني.

واتە: (هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرامە، خوێنەکەیو ماڵەکەیو ناموسەکەی).

بەڵێ، هەندێك لەو خاوەنکارانە، دەستدرێژی دەکەنە سەر موڵکی گشتی، یان تایبەتی، هەروەها بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاری دەهێنن! لە کڕینو فرۆشتنی بەروبوومدا، لە بازاڕو ئاڵوێرکردندا، پەنا بۆ گزیو فرتو فێڵو هەڵخەڵەتاندنی کڕیارو بەکاربەر دەبەن! ئەو جۆرە خاوەنکارانە، لە پێناو خۆ دەوڵەمەندکردندا، پەنا بۆ هەر هۆکارێکی ناشەرعیو نایاسایی دەبنو یاساو ڕێسا باوەکانی ناو

کۆمەڵگە پێشێل دەکەن.

ئایا ئەو جۆرە خاوەنکارانە، وا دەزانن هەر بە جاویدانیو نەمری لـەم دونیایەدا دەمێننـــەوە؟! ئاخۆ ئەوانە بۆچـــی بیرناکەنەوە؟! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دەســـتبەرداری کاری نایاســـاییو ناشەرعی ببـــنو ڕوو لــە کارو کەســـابەتی حەڵاڵ بکەن؟! ئایا نازانن، گشـــت کارەکانیـــان بە گەورەو بچووکەوە، بە وردو درشـــتییەوە، بە کەمو زیادییەوە، بە چاكو خراپییەوە، بە خێرو شـــەڕیەوە، لە تۆمارێکی تایبەتدا دەنووســـرێنەوەو لای پـــەروەردگار پارێزراو دەبێت، تاکوو ڕۆژی هـــەقو حســـابو کتاب، ئەو ڕۆژەی پەروەردگار ڕاســـتییەکان ئاشـــکرا دەکاتو نەهێنییـــەکان دیار دەکاتو پەردە لەســـەر هەموو شـــتێکی نهێنیدا هەڵدەدات، ئەو ڕۆژەی خودای باڵادەســـت فەرمان بە فریشـــتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: خاوەنکارەکان ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. چونکـــە بێگومـــان، ئـــەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایـــا کاتی ئـــەوە نەهاتووە، خاوەنکارەکان لـــە خەوی غەفلەتو دونیاویســـتی بەئـــاگا بێنـــەوەو ڕوو لـــە خوداپەرســـتی بکـــەنو خۆشەویستیی خوداو خەڵك، بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن؟!

مرۆڤـــی ژیر ئەو کەســـەیە کە ســـوود لە دەرفەتـــە زێڕینەکان وەردەگرێـــت، ژیانـــی دونیـــاش گەورەتریـــن دەرفەتـــە لەبـــەردەم هەموومانـــدا؛ بۆئـــەوەی بیقۆزینـــەوەو تۆوی چاکـــەو خێری تێدا بچێنینو لە ڕۆژی هەستانەوەدا بەرهەمەکەی بچنینەوە.

# ئەی کرێکاران‌و کارگوزارو خزمەتکارەکان

ئــەی کرێــکاران‌و کارگوزارو خزمەتکاران! ئێــوەی باوەڕدارو لە خوداتــرس‌و ماندوونەنــاس‌و ڕەنجکێش، هەمیشــە بەهــۆی کارو کەســابەتی حەڵاڵــەوە، خۆشەویســتیی ئاســمان‌و زەوی بەدەســت دەهێنــن‌و هەم خــودا، هەم خەڵکیش لە خۆتــان ڕازی دەکەن‌و لە دونیــاو قیامەتدا، ڕووســوورو ســەربەرز دەبن، بۆیــە هەر لە دێر زەمانەوە گوتراوە: هەمیشە دەستی ماندوو، لەسەر سکی تێرە، ئەو دەستە لای خوداو خەڵك زۆر خۆشەویستە، کە هەردەم وەبەرهێن‌و وزەبەخش‌و بەرهەمهێن‌و باڵاو بەخشەر بێت، هەروەها نەو دەستەی کە چاوی لەدەستی ئەم‌و ئەو بێت، یان بێکارو پانکەرەوەو سواڵکەر بێت‌و لەسەر حسابی ئەم‌و ئەو بژیت، نە خۆشەویستی خودایە، نە لەناو خەڵکیشدا خۆشەویستە.

ئــەی کرێــکاران‌و کارگــوزارو خزمەتــکاران! کار وەك ئاوێنــە وایــە، مرۆڤ بەهــۆی کارەکانییەوە خاڵە بــاش‌و خراپەکانی خۆی دەناســێتەوەو دەزانێــت چ کارێك شــەرعی‌و یاســاییە، چ کارێك ناشــەرعی‌و نایاساییە، چ کارێك باشــە، چ کارێك خراپە، چ کارێك سوودبەخشــە، چ کارێك زیانبەخشــە، چ کارێــك حەڵاڵە، چ کارێك حەرامە، چ کارێك ڕەوایە، چ کارێك ناڕەوایە و....تاد

مخابن، زۆرێك لە کەسانی پاڵەو کارێکارو کارگوزارو خزمەتکار، لەجیاتــی کاری حــەڵاڵ‌و ڕەواو بــاش‌و ســوودبەخش، پەنــا بــۆ ئەنجامدانی کاری حەرام‌و ناشــەرعی‌و نایاســایی‌و نــاڕەواو خراپ

دەبـــەن، یاخـــود مافی خاوەنکار پێشـێل دەکەنو لـــە ئەنجامدانی کارەکانیانـــدا کەمتەرخەمیو خەمســاردی دەکەن، یــان خۆیان لە کارەکان دەدزنەوە، یــان فرتو فێڵو حیلە، لە کارەکانیاندا ئەنجام دەدەن، یان ڕاستییەکان دەشارنەوە، یان دەبن بە ئامێرێك بەدەست هەندێــك خاوەنکاری هەلپەرســتو نابەرپرسو خودانەترســەوە؛ بۆئەوەی بەشــێوەیەکی ناشەرعیو حەرامو ناڕەوا، سەرمایە بۆ ئەو خاوەنکارانە کۆبکەنەوەو ستەمو زۆرداری لەمو لەو بکەن، یاخود لە کارەکانیاندا ناپاکی دەکەنو دڵسۆزانە کارەکانیان ئەنجام نادەنو لە ڕێگەی کارەکانیانەوە، دەیان تاوانو گوناه ئەنجام دەدەن.

بێئــاگا لەوەی خــودای گــەورە، فەرمانیان پــێ دەکات، کە بە چاوێکی کەمو ســووك، سەیری شــتی خەڵك مەکەنو هیچ شتێکی خەڵــك بە کەم مەزانن، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ هود.

واتــە: (ئــەی هۆزو نەتەوەی من! با پێوانەو کێشــانەتان تێرو تــەواوو دادگەرانە بێت، شــتوومەکی خەڵکی، کەمنــرخ دامەنێنو مەیانخەڵەتێنن.. لە وڵاتیشدا، فەسادو خراپەکاریی بڵاو مەکەنەوە).

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەریشــمان (ﷺ) هاتووە: (إن الله تعالى يحب أحدكم إذا عَمِلَ عملاً أن يتقنه).

واتە: (خودای تەعالا، پێی خۆشە کاتێك یەکێك لە ئێوە کارێك دەکات، ئەو کارە بەڕێکوپێکی بکاتو لێی ورد بێتەوە).

لەم ســۆنگەیەوە، لەو جۆرە کەســانە دەپرســین: ئایا لە ڕۆژی هەستانەوەدا، کاتێك هەموو مرۆڤەکان لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو

زینـــدوو دەکرێنـــەوە، کاتێـــك تەرازووی هەقو حســـابو ڕاســـتیو دادگـــەری دادەنرێـــت، کاتێك پـــەروەردگار خۆی دەبێتـــە دادوەرو بانگـــی فریشـــتەکانی دەکاتو پێیـــان دەفەرموێـــت: ئـــەو کرێکارو کارگـــوزارو خزمەتکارانە لە مەیدانی مەحشـــەر ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. چونکە بێگومان، ئەوان پرســـیاریان لێ دەکرێت.

ئایـــا ئامادەباشـــیی ئەوەتان تێدایە، کە وەڵامی پرســـیارە وردو درشـــتەکانی پەروەردگارتـــان بدەنەوە، لەســـەر هەمـــوو ئەو کارە ناشەرعیو حەرامانەی کە ئەنجامتان داون؟ ئایا لەو ڕۆژە سەختو دژوارەدا، بە کۆڵێك تاوانەوە، دەتوانن ئەستۆپاکیی خۆتان بسەلمێنن؟ ئایا لەو ڕۆژە پڕناخۆشـــەدا. دەتوانن بەبـــێ کارتی باوەڕو کرداری چاكو دڵێکی پاکژ، ڕەزامەندیی پەروەردگار بەدەست بهێنن؟!!

جا بۆئەوەی خۆتان بە ئاوی سازگاری تەوبە، لە چڵکیو قڕێژی تاوانو گوناە بشۆنەوەو پاك بکەنەوە؛ بۆئەوەی نەبن بە سووتەمەنی دۆزەخێکی سووتێنەر؛ بۆئەوەی ڕەزامەندیی خودا بەدەست بهێننو پلە بەرزەکانی بەهەشـــت مســـۆگەر بکەن، تکایە واز لە هەموو ئەو کارانە بهێنن، کە ڕیســـوایی دونیاو شـــەرمەزاریی قیامەت، بەدوای خۆیدا دەهێنێت؛ تکایە واز لە کارە ناشەرعیو حەرامەکان بهێننو باقیی تەمەنتان، لە کۆڕی بڕوادارانو خوداپەرســـتان ببەنە ســـەرو بۆ هەتاهەتایە، کۆتایی بە ســـەرپێچیو تاوانو گوناە بهێننو ببنە بەندە کڕنووشبەرە هەرەنزیکەکانی پەروەردگار.

## ئەی شۆفێران

ئەی شـــۆفێران! هەروەك خۆتان ئـــاگادارن، كاری ئێوە، كارێكی زۆر هەســـتیارو مەترســـیدارو پڕبەرپرســـیارێتییە، كارێكی دژوارو ســـەختە، كارێكی پڕهـــەورازو لێژە؛ چونكە پەیوەنـــدی بە ژیانو مردنـــی خەڵكانی دیكەوە هەیە، ئایا دەزانن، ئێوە بەرپرســـیارن لە پاراستنی گیانوماڵی ئەو خەڵكانەی كە لەگەڵتاندا سەفەر دەكەنو پاراستنی نامووسو سەرو ماڵیان، لە ئەستۆی ئێوەدایە! ئایا دەزانن، ڕۆژانە ئەو مرۆڤانەی كە لێرەو لەوێ، لەگەڵتاندا سوار دەبنو دێنو دەچن، ئەمانەتێكن، خودای گەورە بە ئێوەی سپاردوون؟!

بۆیە خودای مـــەزن، لە زاری حەزرەتی لوقمانەوە دەفەرموێت: ﴿ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾ لقمان.

واتە: (لە ڕۆیشـــتندا، نە بەشـــێنەیی، نە بەتونـــدی بڕۆ، واتە: بارێكی مامناوەندیی پێش بگرە، لە دەنگیشت نزم بكەوە لە قسەو گفتوگـــۆدا؛ چونكە دەنگی هەرەناخۆش، ئەوەیە زیاد لە پێویســـت بەرز بكرێتەوە، زەڕەو دەنگی كەرانە).

هەروەهـــا داواتـــان لـــێ دەكات، كـــە ســـپاردەكانی خەڵكـــی بۆ بگەڕێننەوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

واتە: (بێگومان خودا، فەرمانتان پێ دەدا، كە هەموو ئەمانەتو ســـپاردەیەك بدەنەوە دەســـت خاوەنەكەیو هەركات دادگایی نێوان

مەردوم دەکەن، دادگەرانەو بەیەکسانی داوەری بکەن، واتە: بە لای هیچ کەسێکدا دامەبڕن).

پێغەمبەریـــش (ﷺ) دەفەرموێ: (أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَـنِ ائْتَمَنَكَ، وَلا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ). پێشەوا ئەحمەد: ٢/٤٠٤.

واتە: ســپاردە بــدەروە دەســت خاوەیــن ســپاردەکە، هەرگیز خەیانــەتو گــزی مەکــەن، تەنانەت لەگــەڵ ئەو کەسەشــدا، کە خەیانەتی لێ کردوویت).

لەم ســۆنگەیەوە، هەروەك چۆن پاراســتنی گیانو ماڵی خەڵكو ڕێزگرتــن لە یاســاکانی هاتوچۆو دوورکەوتنەوە لــە ناپاکیو هەر جــۆرە کارێکی نامرۆڤانــەو بێویژدانانەو نابەرپرســانە، لای خودا پاداشتی خۆی هەیەو لای خەڵکیش جێگەی ڕێزو پێزانینە. ئاواش لادان لە یاساو ڕێساکانی هاتو چۆو ناپاکیکردن لەگەڵ گەشتیاران، هەروەها پێشێلکردنی مافیانو دەستدرێژیکردنە سەر سەرو ماڵیانو بێرێزیکــردن بەرانبەریــانو کەمتەرخەمیکــردن لە ناســت مافە مەعنەوی مادییەکانیان، جگە لەوەی یاساشــکێنیو سەرپێچکردنە، هەروەها تاســەر ئێســقان، کارێکی ناشــەرعیو حەرامیشە؛ چونکە دەســتدرێژییە بۆ ســەر مافــی خەڵکانی دیکــەو بێفەرمانیکردنی خوداو پێشێلکردنی سەروەریی یاسایە.

مخابــن! زۆرێك لە شــۆفێرەکان، ڕۆژانە لێرەو لــەوێ لە کاتی هەڵســووڕاندنی کارەکانیانــدا، بێفەرمانیــی خودا دەکــەن، مافی گەشــتیاران پێشــێل دەکــەن، گەمــە بــە چارەنووســیان دەکەنو چارەنووســیان دەدەنە دەســت هەواو هەوەســی خۆیان، بێرێزیو ناپاکییــان بەرانبــەر ئەنجام دەدەن، ســووکایەتییان پــێ دەکەن،

زیانیان پێ دەگەیەنن، مافیان دەخۆن، دەستدرێدژییان دەکەنە سەر، یاساکانی هاتوچۆ پێشێل دەکەنو ڕێز لە بڕیارەکان ناگرن، زێدە لە ئەندازە، پارە لە خەڵك وەردەگرنو وەك مەڕ دادەدۆشنو مافو هەقیان هەڵدەلووشن، مافی ڕێگە نادەنو گیانی بەرپرسیارێتییان تێدا نییە، بەندەی دینارو پارەوپووڵو...تاد!!

بۆیە ڕووی قسەکانمان، لەو جۆرە شۆفێرانەیە، کە هەگبەیان پڕە لە تاوانو گوناها!! ئایا ئەو جۆرە شۆفێرانە، لە خۆیانیان پرسیوە: کە ڕۆژی هەستانەوەو لێپرسینەوەو هەقو حسابو کتاب هەیە؟ ئایا دەزانن، کە ژیانی دونیا، تەنها وێستگەیەکی ژیانەو شوێنی تاقیکردنەوەیە؟ ئایا دەزانن، کە ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی ئاشکراکردنی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەی دونیایە، لەو ڕۆژە سەختەدا، هەموو کەسێك کارتی خۆی وەردەگرێت، بەڵام تەنها ئەو کەسانە مافی پەڕینەوەیان دەبێت بەرەو بەهەشت، کە لە دونیادا ڕەزامەندیی خودایان بەدەست هێنابێت؟!

ئایا ئەو جۆرە شۆفێرە تاوانبارو ستەمکارانە، خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە حازر کردووە؟! کاتێك پەروەردگاری تۆڵەستێن فەرمان بەفریشتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت، شۆفێرەکان ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا چیتان بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە حازر کردووە؟!!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، واز لە تاوانو گوناه بهێننو لە قاپی خودای میهرەبان بدەنو هەر لە دونیادا خۆتان بکڕنەوە، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت، بە هەمو ماڵی دونیا، نەتوانن خۆتان

بکرنەوەو گەردنی خۆتان ئازاد بکەن‌و خۆتان لە ئاگری سووتێنەری دۆزەخ رزگار بکەن.

بێگومــان، دەرگای رەحمەتی خودای دلۆڤان، هەمیشــە لەســەر پشــتەو هەر کەســێك گەرەکی بێت، دەتوانێت لەو دەرگایە بچێتە ژوورەوەو لــەو نازو نیعمەت‌و رەحمەتە، ســوودمەندو بەهرەمەند بێت.

## ئەی کچ‌و کورە گەنجەکان

ئەی کچ‌و کورە گەنجەکان! تەمەنی گەنجێتی، خۆشترین تەمەنی ژیانە، بۆیە بە بەهاری تەمەن ناســراوە.. لەو تەمەنەدا، مرۆڤ لە لوتکەی بەهێزیدایەو بەرەو ئاســۆیەکی گەش‌و ئایندەیەکی رۆشن هەنگاو دەنێت، بۆیە باش بەکارهێنانی ئەو تەمەنە، دەبێتە مایەی ســەرفرازی دونیاو قیامەت، بەڵام خراپ بەکارهێنانیشــی، دەبێتە مایەی شەرمەزاری‌و میحنەتی‌و مەینەتی‌و نەگبەتی بۆ خاوەنەکەی!

مخابــن، هەندێك لەو کورو کچە گەنجانە! نە بەتەواوی خۆیان ناسیوە، نە خودای خۆشیان ناسیوە، بۆیە بە لارێدا چوون، خەریکە لە ناو زەلکاوی تاوانەکاندا نغرۆ دەبن‌و هەم خۆیان ناشیرین دەکەن، هــەم کۆمەڵگــەو ئایینەکەشــیان! ئەو جۆرە گەنجە کــورو کچانە، دۆو دۆشــاو تێکــەڵ دەکەن‌و لــە تاوانە گەورەکان ســڵ ناکەنەوەو جڵەوی خۆیان داوەتە دەســت ئیبلیس‌و شەیتاننناساکان، بۆیە وەك رۆبۆتێك‌و بووکەشووشــەیەکن بەدەست ئەم‌و ئەوەوەو لاسایی ئەم‌و ئــەو دەکەنەوەو بیــر لە ئایندەی خۆیان‌و نیشــتمان‌و گەلەکەیان

ناکەنــەوە، ڕۆژانە لێــرەو لەوێ، بێفەرمانیی خــودا دەکەنو لەناو بۆتەی تاوانەکاندا، خۆیان دەتوێننەوە.

ئەو جۆرە کوڕو کچە گەنجانە، دڵی خۆیان بە عیشقێکی ناپاکەوە کۆتو بەند کردووە.. بە ناوی خۆشەویستی، ئاشی تاوانەکان دەگێڕن، تینووی هەوەســبازینو خۆیانو هاوڕەگەزەکانیان لەخشتە دەبەنو دەستخەڕۆ دەکەن.

بەچاوی دڵەوە، ســەیری شتەکان دەکەن، نەك بە چاوی عەقڵ.. زۆربــەی کارەکانیــان، لەســەر بناغەی هەســتو هــەوەس ئەنجام دەدرێت، نەك ژیریو بیرتیژی.

مخابن! ئەو کوڕو کچە گەنجانە، هەم بۆ خۆیان کێشەو دەردەسەری درووســت دەکەن، هەم بۆ کۆمەڵگەو مرۆڤایەتیش، بۆیە بەو جۆرە گەنجانە دەڵێین: لە خودا بترسێن، چاوێك بە کارو کردەوەکانتاندا بخشــێننەوە، لە ڕێگەی پەشێمانبوونەوەو تەوبەیەکی نەسووحەوە، لاپەڕەیەکــی تازە لەگەڵ پەروەردگارتان هەڵبدەنەوە، واز لە تاوانو گوناهو هەڵخەڵەتاندنو چەواشەکاری بهێنن، نەبن بە سەرچاوەیەك بــۆ تاوانو ســتەمو نەزانین، ئایــا لە بیرتان چووتــەوە، کە ڕۆژی هەقو حســابو لێپرســینەوە هەیە، لەو ڕۆژە ســەختو دژوارەدا، پەروەردگار پرســیاری تەمەنی گەنجییێتیتــان لێ دەکات، کە چۆن بەڕێتــان کــردووەو چ کارو کردەوەیەکتان ئەنجــام داوە؛ کردەوەی بــاشو خێرو چاکە، یان کردەوەی خراپو شــەڕو تاوان؟! هەروەك پێغەمبەرمان(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ) أخرجه الحاكم والمنذري.

واتە: (پێنج شـت، پێش هاتنی پێنج شـت بە دەرفەت بزانەو بیقـۆزەرەوە: گەنجێتیت پێـش پیربوونت، تەندرووسـتیت پێش نەخۆشـکەوتنت، دەوڵەمەندیت پێش هەژاربوونت، دەسـتبەتاڵیت پێش سەرقاڵبوونت، ژیانت پێش مردنت).

هەروەها پرسـیارتان لێ دەکات، ئاخۆ لە دونیادا بۆ خودا ژیان، یان بـۆ غەیری خودا؟! لە دونیادا ڕۆڵی ئاوەدانکردنەوەو سـازانو ئاشـتیو تەباییو چەسپاندنی یاساتان بینی، یان ڕۆڵی ڕووخاندنو شەڕو فیتنەو دووبەرەکیو لێکترازانو چەواشەکاری؟!

ئایـا عاشـقی ڕاسـتیو هەقیقەت بـوون، یان عاشـقی دڵبەرو ئەڤینێکی شێتانە؟!

پێویسـتە ئەم کوڕو کچە گەنجانە، هەر لە ئێسـتاوە خۆیان بۆ ڕۆژی هەسـتانەوە حازرو ئامادە بکەن، کاتێك ئەم پرسیارانەو هی تریان لێ دەکرێتو پەروەردگاری باڵادەست، فەرمان بە فریشتەکانی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو کوڕو کچە گەنجانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات بێگومان، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایـا چیتان بۆ ئەو ڕۆژە سـەختو دژوارە حازر کردووە؟! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، چرای باوەڕو ئیمان لەناو دڵتاندا دابگیرسێنن؛ تاکـوو چیتر، لە شـەوەزەنگی تاریکیدا نەژینو بەرەو ئاسـۆیەکی گـەشو خۆش هەنگاو بنێنـن؟! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، ئیتر واز لە تاوانو گوناهو سـتەم بهێننو ڕوو لە خوداو پشـت لە شەیتانو شەیتاندۆستان بکەن؟!

ئایا نازانن، ژیانی دونیا بەبەراورد بە ژیانی قیامەت، هێندە کەمە، بەقـەدەر دڵۆپێك ئاو نابێت، لـە زەریایەکی بێبندا؟! بۆیە مرۆڤی

ژیرو عاقڵ، هەرگیز زێڕو ئاڵتوون بە خۆڵو خاشـاك ناگۆڕێتەوە، مرۆڤی هۆشمەند، هەرگیز ژیانێکی نەبەدیو هەمیشەییو جاویدانی بە ژیانێکی کاتیو سەرپێیی ناگۆڕێتەوە!!

## ئەی وەرزشوانان

ئەی وەرزشـوانان! بێگومـان وەرزش، لە جیهانـی ئیمرۆماندا، پێگەیەکـی بەهێـزی هەیە، تەنانـەت بووەتە ناسـنامەی گەلانو زۆر گەلو وڵات بەهۆی وەرزشـەوە، خۆیان بەجیهان ناسـاندووەو هەبوونـی خۆیان سـەلماندووە، وەرزش وێڕای ئەوەی سـوودێکی زۆری بۆ جەستەی مرۆڤ هەیە، سەرچاوەیەکیشە بۆ بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووریو پێکەوەژیانی گەلانو بەرقەرارکردنی ئاشـتیو درووستکردنی پردی خۆشەویستی لە نێوان تاکەکانو میللەتاندا.

بەڵام هەموو شتێك بە خوێ خۆشە، خوێش بە ئەندازە، چێشت ئەگەر بێخوێ بێت؛ تامی نییە، ئەگەر سوێریش بێت؛ خۆش نییە، بۆیە هەموو ئەوانەی لە کایەی وەرزشدا کار دەکەن، لە یاریزانانەوە بگرە، تا دەگاتە ئەوانەش کە هاندەری وەرزشن، پێویستە لە ژیانی خۆیاندا، هاوسـەنگ بنو ئەو هاوسـەنگییەش ڕابگرن کە لە نێوان وەرزشو کایەکانی دیکەی ژیاندا پێویستە هەبێتو پارێزراو بێت.

بێگومان ئیسلام، هانی موسڵمانان دەدات، کە وێڕای بەهێزکردنی باوەڕەکەیـان، گرنگـی بـە وەرزشو بەهێزکردنی جەسـتە بدەن؛ چونکە هەر وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ

وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍ خَيْرٌ. اخرجه احمد ٢/٣٦٦(٨٧٧٧) و«مسلم» ٥٦/٨ و«النسائي» في «الكبرى» ١٠٣٨٣. انظر حديث رقم: ٦٦٥٠ في صحيح الجامع .

واتە: (باوەڕداری بەهێز، باشترو خۆشەویسترە لە باوەڕداری بێهێز، لە هەردووکیشیاندا خێر هەیە).

بەڵام نابێت، زیادەڕەوی لە وەرزشدا بکرێت، زۆر مخابن! زۆرن ئەو وەرزشوانو یاریزانو هاندەرانەی کە مامەڵەیەکی ناتەندرووست لەگەڵ وەرزشدا دەکەن، هەروەها خۆشەویستیی وەرزش، هێندە لەناو دڵو دەروونیاندا چەسپیوە، تەنانەت لای هەندێك کەس گەیشتووەتە ڕادەی پەرستن! وەرزش لای زۆرێك لە وەرزشوانان خراوەتە پێش ئایینو نیشتمانو میللەتو کار، تەنانەت خزمو کەسیش!!

ڕۆژانە لێرەو لەوێ بە هەزاران کەسی وەرزشڤان، یان وەرزشدۆست، بەدیار یارییەکانەوە، کاتی خۆیان دەکوژن، تەنانەت زۆر جار نوێژیشیان دەچووێنن‌و مافی ماڵو منداڵو هاوسەرەکانیشیان پێشێل دەکەن، وێڕای ئەو زمانە زبرو تیژەی کە دژ بە یەکتری بەکار دەهێننو تەنانەت هەندێك جار توندوتیژیو کوشتنیشی لێ دەکەوێتەوە!!

ئایا پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمانمان پێ ناکات کە لە کاتی تووڕەییدا، دان بەخۆدا بگرین، لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، أي الذي لا يغلبه الرجال إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ) البخاري.

واتە: (مێرچاکی بە زۆرانبازی نییە، واتە: ئەوی کە پیاوان بەسەریدا سەر ناکەون، بەڵکوو بەوەیە لە کاتی تووڕەییدا، جڵەوی

نەفسی خۆی بگرێتو دانبەخۆداگر بێت).

بەڕاستی گەنجە وەرزشدۆستەکانمان، گرەو لەسەر ئەسپی تۆپیو دەکەن! نازانم ئەم هەموو کاتکوشتنو خۆخافڵاندنو خۆلەکاردزینەوەو یەکترتەریقکردنەوە بۆچیو لەپای چی؟!!! بەداخەوە، ئەوان لە خەیاڵێکی قووڵدا دەژینو تەنها شەکەتیو کات کوشتنو یەکتر ناشیرینکردنیان بۆ دەمێنێتەوە.

بۆیە بە یادی ئەو جۆرە کەسانە دەهێنینەوە، کەوا ئەوان تەنها بۆ ئەوە درووستنەکراون، کە هەموو هەمو غەمیان وەرزشو وەرزشکردن بێتو ئامانجە سەرەکییەکانیان بیر بچێتەوە، کە بریتییە لە خوداپەرستیو ئاوەدانکردنەوەی زەویو بەرقەرارکردنی ئاشتیو دادگەری لە سەرتاپای جیهاندا.

بۆیە خودای مەزن لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: (من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیم درووست کردووە؛ تاکوو بمپەرستنو بمناسن).

ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە لە خودا ناترسێن، کاتێك لەبەر خاتری وەرزش، ئەرکە ئایینیو نیشتمانیو نەتەوەییو خێزانییەکانیان پشتگوێ دەخەنو بەرایی دەدەنە وەرزش! ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە لە خودا ناترسێن، کاتێك ڕۆژانە بەشێکی زۆر لە تەمەنی خۆیان بە وەرزش دەبەخشنو خۆیان لە ئەرکەکانی دیکە دەدزنەوە! ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە، لە خودا ناترسێن کاتێك کە بێ فەرمانی ئەو زاتە دەکەنو لە میانەی وەرزشکردندا تاوانو گوناه ئەنجام دەدەنو لە بری خودا،

وەرزش دەپەرستن! ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە لە خودا ناترسێن کاتێك پەنا بۆ ناوزڕاندنو تۆمەتهەڵبەستنو جوێندانو ناشیرینکردنی یەکتری دەبەن!

ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە لە خودا ناترسێن، کاتێك زۆربەی کاتەکانیان بەدیار شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە بەسەر دەبەن؟! ئایا لەو ڕۆژە سامناکە ناترسێن، کاتێك پەروەردگار فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئەو وەرزشوانو وەرزشدۆستانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الصافات. چونکە بێگومان، پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایا ئەو وەرزشڤانو وەرزشدۆستانە، هیچ ئامادەکارییەکیان بۆ ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە کردووە، کاتێك لەسەر هەموو کارە وردو درشتەکانیان، پرسیاران ئاڕاستە دەکرێتو دەفتەری کردارەکانیان دەکرێتەوەو پەروەردگار پێیان دەفەرموێت: فەرموون خۆتان نامەی کردارەکانتان بخوێننەوە؟!! ئایا لەو ڕۆژە نالەبارەدا، ڕوویان دێت لە حزووری پەروەردگارو فریشتەو هەمووو بوونەوەردا دەفتەری کردەوەکانیان بخوێننەوەو خۆیان لەو ڕۆژە ڕەشە ڕزگار بکەن، کە بە قەدەر ٥٠٠٠٠ هەزارساڵی دونیایە؟!! بێگومان نەخێر، بۆیە باشتر وایە هێشتا کار لە کار نەترازاوەو ڕۆحیان لەناو جەستەدا ماوە، واز لە بێفەرمانییەکانی خودا بهێننو بە دڵێکی پاكو نیازێکی پاكو کردەوەیەکی پاکەوە بگەڕێنەوە لای پەروەردگاری خۆیانو چیتر زیادەڕەوی لە وەرزشدا نەکەن؛ تاکوو گەواهییان بۆ بدات، نەك گەواهییان لەسەر بدات.

# ئەی میدیاكارو ڕاگەیاندنكاران

ئـــەی میدیـــاكارو ڕاگەیاندنـــكاران! ئیمرۆ ڕاگەیاندن بە گشـــت كەناڵەكانییـــەوە، پانتایەكی فراوانی لە ژیانی گەلانی جیهان داگیر كردووە، جیهانی كردووەتە گوندێكی بچووكو ماڵێكی گەورە.

ڕاگەیاندن لەم ســـەردەمەدا، زۆرترین كاریگەریی لەسەر وەرگر هەیەو دەتوانێت بچێتە ناو قووڵایی ویژدانو دڵو دەروونو هەستو نەستییەوە.

ڕاگەیاندنو ڕاگەیاندنكاران دوو ئاڕاســـتەو دوو ڕووی جیاوازیان هەیە.

ئـــەو ڕاگەیاندنكارانەی ڕاســـتییەكان وەك خـــۆی بە خوێنەران دەگەیەنـــن، ئـــەو ڕاگەیاندنكارانەی دەبنە دەنگو ڕەنگی ڕەســـەنی ستەمدیدەو بێنازو هەژارو لێقەوماوان، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی دەبنە پـــرد لە نێـــوان پێكهاتەكان بۆ بەرقەراركردنی ئاشـــتیو دادگەریو پێكەوە ژیانو پێكەوە ســـازان، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی دەبنە دەرمان بۆ ســـاڕێژكردنی برینەكانو زامەكان، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی پەنجە لەســـەر كەموكووڕییەكانی كۆمەڵگە دادەنێن، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی كێشـــە كەلتوورییەكانی ناو كۆمەڵگە ڕووماڵ دەكەنو دەخەنە ڕوو، ئـــەو ڕاگەیاندنكارانەی دەنگی هەقو ڕاســـتی بـــەرز دەكەنەوە، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی دەتوانن جوانیو ناشیرینییەكان وەك خۆ نمایش بكەن، ئەو ڕاگەیاندنكارانەی بەرپرســـانە مامەڵـــە لەگەڵ ڕووداوو پێشـــهاتەكانی ژیـــان دەكـــەن، دەتوانن ڕووی ڕاســـتەقینەی خۆیان

دەربخەنو ڕێزو پلەوپایەو شکۆمەندیی خۆیان، لەناو کۆمەڵگەدا بپارێزنو لە بنیادنانی ژێرخانی هزریو مەعریفیو زانستیی کۆمەڵگەدا، شوێندەستیان دیار بێتو بەرەو ئاراستەیەکی ڕاستیش هەنگاو دەنێن.

بەڵام جۆرە ڕاگەیاندنێکی دیکەمان هەیە، تەواو پێچەوانەیەو ڕوویەکی ڕەشی هەیەو لەلایەن میدیاکارانێکی هەلپەرستو لەخودانەترسو نابەپرسو ڤینلەدڵەوە ئاراستە دەکرێت.

ئەم جۆرە ڕاگەیاندنو ڕاگەیاندکارانە، سەرچاوەی سەرەکین بۆ بڵاوکردنەوەی تاوانو گوناه، ڕۆڵێکی کارایان هەیە لە تێکدانی شیرازەی کۆمەڵو خێزانو ئاژاوەنانەوەو بەلاڕێدابردنی گەنجانو چەواشەو گومڕاکردنی خەڵکو تێکدانی ئاشتیی کۆمەڵایەتیو وروژاندنی هەستی لاوانو دوورخستنەوەیان لە خوداو بەها مرۆڤیو ئایینییەکان.

مخابن! ئەم جۆرە ڕاگەیاندنو میدیاکارانە، نابەرپرسانە پەیامە ژەهراوییەکەیان لەناو چینو توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگەدا بڵاو دەکەنەوە، بۆیە هەمیشە بەشێکن لە گرفتو بەشێك نین لە چارەسەر، لە جیاتی ئەوەی گوڵ بنو بۆنی خۆش بڵاو بکەنەوە، هەردەم دڕکن لەناو باخچەی ڤیانو ژیانداو هەستو نەستو ویژدانی مرۆڤە دڵزیندووەکان زامدار دەکەن، بەردەوام میکرۆبو ڤایرۆسی کوشندەن لەناو خوێنی جەستەی کۆمەڵگەدا، کاریان تەنها چاندنی تۆوی کەربو کینو بەدڕەوشتییە لەناو کێڵگەی ژیاندا.

بەڵێ، ئەم جۆرە میدیاو میدیاکارانە، بەنزین بە ئاگردا دەکەنو تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێننو کۆتری ئاشتی لە ئاسمانی بێگەردی

نیشتماندا دەتۆرێنن.

بۆیە کاتی ئەوە هاتووە، ئەو جۆرە میدیاکارانە، بە کارو ڕەفتارو گوفتارەکانـــی خۆیاندا بچنەوەو پشـــت لە شـــەیتانو ڕوو لە خودا بکـــەنو بیر لە مـــردنو قۆناغەکانی دوای مـــردن بکەنەوە، کاتێك پەروەردگار فەرمان بەفریشتەکانی خۆی دەکاتو پێیان دەفەرموێت: ئـــەو میدیاکارانـــە ڕاگـــرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. چونکە بێگومان، پرسیاریان لێ دەکرێت.

کاتێك لەو ڕۆژە ســـەختەدا، نامـــەی کردەوەکانیان دەکرێتەوەو داوایـــان لـــێ دەکرێـــت، خۆیـــان نامەی کـــردەوە نەگریســـەکانیان بخوێننەوە، هەروەك خودای باڵادەســـت لەبـــارەی کارنامەکەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ الإسراء.

واتـــە: (نامـــەی کـــردەوەی هەر کەسێکیشـــمان هەڵواســـیوە بە گەردەنیداو لە ڕۆژی دواییدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین، بە کراوەیی دەیخەینە بەردەستی، ئەوسا پێی دەگوترێت: دەی نامەی کردەوەکانـــت بخوێنەرەوەو تەماشـــای بکە، ئیمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدەو حیساب بۆ خۆت بکە، کە شایستەی چ جۆرە پاداشتێکیت).

ئایا لەو ڕۆژە ســـەختەدا، کە پەروەردگار ئەو جۆرە کەسانە بۆ هەقو حســـاب زیندوو دەکاتەوە، ئاخۆ ئەو جۆرە کەسانە، دەتوانن ببنـــە پارێزەری خۆیـــانو بەرگری لـــە تاوانەکانیان بکـــەن؟! ئایا دەتوانن بڕیار لەســـەر چارەنووســـی خۆیان بـــدەن؟! ئایا چۆن بە کۆڵێـــك گوناهو تاوانەوە، دەچنە خزمەت پەروەردگاری جیهانیان؟!

ئایـــا کەس هەیە، بە هانایانەوە بێـــتو فریایان کەوێت، بێجگە لە کرداری باشو دڵێکی ساغو بڕوایەکی بێگەرد؟!

بۆیە تکامان وایە، ئەم جۆرە کەســانە بــەدوای کڵاوی بابردوو نەکــەونو بە دونیایــەك هەڵنەخەڵەتێن، کە چەنــد ڕۆژو مانگـو ساڵێکەو ئیتر کۆتایی دێت.

## ئەی دەسەڵاتدارو کاربەدەستان

ئەی دەســەڵاتدارو کاربەدەستان! ئەی ئەو کەســانەی کە هەر پلەوپایەو بەرپرســیارێتییەکتان هەیــەو بەڕێوەبردنـــی میللــەتو وڵات لە ئەســتۆی ئێوەدایــە! جــا بەرپرســیارێتییەکە کەم بێت، یــان زۆر، گــەورە بێت، یان بچووك، سووك بێت، یان قورس.. هەروەك دەزانن، وەرگرتنی بەرپرسیارێتي، ئیمتیاز نییە، بەڵکوو تا سەرنێسقان ئەرکێکی قورسو گرانەو دەبێتە ئەرکو دەکەوێتە سەرشانتان، بۆیە ئەو کەسەی لە هەمبەر ئەرکەکەیدا، خەمساردو کەمتەرخــەم بێــتو ئەرکی خۆی وەك پێویســت جێبەجێ نەکاتو خۆی لە ئەرکەکــەی بدزێتەوەو ڕۆڵی خۆی فەرمۆش بکاتو پشــت لە خوداو میللەت بکات، لە دونیادا شەرمەزارو لە قیامەتیشدا ڕیسوا دەبێتو سزا دەدرێت.

بێگومــان هەرکاتێك ئێوەی بەرپرس لە کارو ئەرکەکانتاندا دەســتپاكو دڵپاكو داوێنپاكو هەستپاكو هزرپاكو کردارپاك بوون، هەروەها زاناو داناو بەتواناو لێهاتووو ســەرکەوتووو تێگەیشتووو پێگەیشتوو بوونو لە مەیدانی کارو کۆششــدا، ئازاو شارەزاو چاوکراوەو دووربینو واقعبینو قووڵبین بوونو کارەکانتان بە پلانو ڕاوێژو بەپێی پێوەرە زانســتییەکان بەڕێوەبردو کەسی

شیاوتان لە شوێنی شیاودا دانا، ڕێزتان لە یاساو ڕێساکان گرتو پارێزگاریتان لــە بەهــا مرۆڤیو ئایینییەکان کــردو بوونە پارێزەری مــافو ئازادییەکان، بەرژەوەندیی گشــتیتان خستە ســەرووی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانتانەوەو خەمی خەڵکتان، بە خەمی خۆتان زانیو ئاوەدانیو خۆشــبژێویی کۆمەڵگە، هیواو ئاواتی ئێوە بوو، مسۆگەر هەم لە دونیا، هەمیش لە قیامەت ڕێزلێگیراوو ســەربەرزو سەرفراز دەبن؛ چونکە لە ئەستۆگرتنی هەر ئەرکێك، کەم بێت، یان زۆر، بچووك بێت، یان گەورە، بەرپرسیارێتییەکی گرانە، هەموو کەسێك ناتوانێت شــان بداتە بەر ئەو بارە گرانــە، لەم بارەیەوە پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێت: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْـؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْـؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْـؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْـؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَمَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ». (اخرجه الإمام البخاري).

واتە: (هەمووتان شواننو هەمووشتان بەرپرسیارن لە شوانیتان، پێشەوا شــوانەو بەرپرسە لە شــوانییەکەی، پیاو شوانەو بەپرســە لە شوانییەکەی، ئافرەت شــوانە لە ماڵی پیاوەکەیو بەرپرســە لە شــوانییەکەی، خزمەتکار شوانە لە ماڵی گەورەکەیو بەرپرسیشە لە شوانییەکەی).

هەروەها خودای تۆڵەســتێن، لەســەر کارە وردو درشتەکانتان پرسیارتان لێ دەکات، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ الحجر.

واتە: (ســوێند بە پەروەردگارت، پرسیار لە هەموویان دەکەین بە گشتی (لە بیرو باوەڕی هەموویان دەکۆڵینەوە)، لەو کارو کردەوانەی دەیانکرد).

بۆیــە نەکــەن تخونــی خیانەت(ناپاکی) بکــەون، ناپاکی لە خــودا، لە پێغەمبــەر، لــە ئایین، لە مرۆڤ، لــە کۆمەڵگە، لە بەرپرســیارێتی و...تاد). هــەروەك خودای مەزن فەرمانتــان پێ دەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ

ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأنفال.

واتــە: (ئــەوی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خیانــەت نەکەن لە خوداو لە پێغەمبـەر(ﷺ)، بەوەی کەمتەرخەمیتان لــە فەرمانبەرداریياندا، هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەتو سـپاردەکانتان، کە پێتان دەسـپێردرێت، لە کاتێکدا کە ئێوە دەزانن، ئەو کارەتان خیانەتە).

بۆیە ئەگەر کەسـانێك لە ئێوە لەو بەرپرسـانە بن، کە پۆستەکانیان بۆ خۆدەوڵەمەندکردنو فیزو دەعیەلێدان بەسـەر خەڵکەوە بەکار دەهێنن! کە ویژدانیان لە ئاست پارەوپووڵو پلەوپایەو کۆشكو تەلاردا خامۆشو بێدەنگە! کە تەنها خۆیان لەبیرەو خەڵکیان لەبیرچووەتەوە! کە تا بیناقاقا کەوتوونەتە ناو زەڵکاوی گەندەڵیو زێدەڕەویو یاساشـکێنی! کە ڕۆژ بەڕۆژ خوێ دەکەنە زامەکانو سیاسەتی (بانێکەو دوو هەوا) پەیڕەو دەکەنو خۆڵ دەکەنە چاوی خەڵکەوەو بە وشـەی بریقـەدارو گوفتاری بێکردار دەسـتخەڕۆیان دەکەن! کە چارەنووسـی میللەتو کۆمەڵگە بـەرەو هەڵدێر دەبەن، کە بەرژەوەندیی گشتی دەکەنە قوربانی بەرژەوەندیی تایبەت، کە ڕێز لە یاساو بەها مرۆڤیو ئایینییەکان ناگرن، کە ویژدانو دڵیان وەك بەرد وایەو هەستیان ناجووڵێت، وەك مشەخۆر لەسەر جەستەی کۆمەڵگە دەژین.

بەڵێ، ئەو جۆرە بەرپرسـانە، ئەگەر بیر لە حاڵی خۆیان نەکەنەوەو بە خۆیانــدا نەچنــەوەو نەگەڕێنەوە بۆ لای پــەروەردگارو مافەکانی خەڵك بۆ خەڵك نەگەڕێننەوەو زوو بەزوو فریای خۆیان نەکەون؛ لە ڕۆژی هەستانەوەدا، ڕووبەڕووی چارەنووسـێکی ڕەشو خراپ دەبنەوەو پەروەردگار لەسەر پردی سـیرات ڕایان دەگرێـتو فەرمان بە فریشـتەکانی دەکاتو دەفەرموێت: ئەو بەرپرسـانە ڕاگرن: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات. چونکە بێگومان پرسیاریان لێ دەکرێت.

ئایـــا کام بەرپـــرس، خۆی بۆ ئەو ڕۆژە ســـەختو دژوارە ئامادە کردووەو زادو توێشـــووی تـــەواوی بـــۆ ئەو ســـەفەرە دوورو درێژە هەڵگرتـــووە؟! ئایا ئەو بەرپرســـانە، کە نابەرپرسانە ئەرکو کارەکانیان ڕاپەڕاندووە، دەتوانن لـــە بەردەم پەروەردگاردا ســـەری خۆیـــان بەرز بکەنـــەوەو بەرگری لە کارە هەڵەکانیـــان بکەن؟! ئایا کاتێك پەروەردگار دەبێتە قازیو قەزاوەت لە نێوان ئەو بەرپرسانەو خەڵکیدا دەکات، ئەو جۆرە بەرپرسانە دەتوانن بەرگریی لە خۆیـــان بکەن؟! ئایـــا دەتوانن ماف بۆ خاوەن مافەکان بگەڕێننەوە؟! ئایا لەو ڕۆژە ســـەختو دژوارەدا، پارەوپووڵو پلەوپایەو کۆشـــكو تەلارو سەڵتەنەتو دەستەڵاتیان، دادیان دەداتو دەتوانن بەرگرییان لێ بکاتو لەو دۆخە نالەبارە ڕزگاریان بکات؟!

ئەڵبەتـــە نەخێر؛ چونکە ئـــەو ڕۆژە، ڕۆژی وەرگرتنەوەی ئەنجامەکانە، مـــرۆڤ لە کێڵگـــەی دونیادا چیـــی بچێنێت، لـــە ڕۆژی هەســـتانەوەدا ئەوە دەدوورێتـــەوە. لەو ڕۆژە ســـامناکەدا، تەنهـــا باوەڕێکی ڕاســـتەقینەو کردارە باشەکان، فریامان دەکەونو لەو زاڵگەیە ڕزگارمان دەکەن.

بۆیە پێویســـتە هەموو کەســـێك لە هەر پلەوپایەو بەرپرســـیارێتییەکدا بێـــت، خۆی بۆ ئەو ڕۆژە حـــازر بکاتو بە دڵێکی بێگەردو باوەڕێکی بەهێزو هەگبەیەکـــی پڕ لە خێـــرو خێراتو چاکەوە، بگەڕێتـــەوە لای پەروەردگاری خـــۆی، تا بتوانێـــت کارتی ڕەزامەندیی پـــەروەردگار بەدەســـت بهێنێتو بۆ هەتاهەتایە، لەناو مێرگو باغەکانی بەهەشتدا، دڵخۆشو ئاسوودە بێتو تێیدا بحەسێتەوەو نۆقرە بگرێت.

# وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ

(ڕایانگرن، بێگومان پرسیاریان لێ دەکرێت)



چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر